له بلاوكراوه‌كانی (ده‌سته‌ی كورد)ی كۆڕی زانیاری



# هه‌نگاوێكی تر



# بــه‌ ڕێگای



# چه‌سپاندنی شێوه‌نووسینێكی ڕاست‌و له‌باری وشه‌ی كوردیدا

كۆمه‌ڵه‌ بابه‌تێكه‌ به‌ مه‌به‌ستی ته‌ختكردنی كه‌ندوكۆسپه‌كانی ڕێگای نووسینی ڕاست‌و له‌باری وشه‌ی كـوردی نووسـراون‌و ، سیانی پێشوویان له‌ سیمینارێكـی ده‌سـته‌ی كـوردی كۆڕی زانیاریـدا خوێنراونه‌ته‌وه‌ كه‌ له‌ ١٩٩٩/١٠/٢٤ دا گیراوه‌ .

چاپخانه‌ی كۆڕی زانیاری ـ به‌غـدا

١٤٢٢ی ك . ❋ ٢٠٠١ی ل .

**له بلاوكراوه‌كانی (ده‌سته‌ی كورد)ی كۆڕی زانیاری**



# هه‌نگاوێكی‌تر
# بـــه ڕێگای
# چه‌سپاندنی شێوه‌نووسینێكی ڕاست‌و له‌باری
# وشه‌ی كوردیدا

كۆمه‌ڵه بابه‌تێكه به مه‌به‌ستی ته‌ختكردنی كه‌ندوكۆسپه‌كانی ڕێگای نووسینی ڕاست‌و له‌باری وشه‌ی كـوردی نووســراون‌و ، ســیانی پێشوویان له سیمینارێكـی ده‌ســته‌ی كـوردی كۆڕی زانیاریــدا خوێنراونه‌ته‌وه كه له ١٩٩٩/١٠/٢٤ دا گیراوه .

چاپخانه‌ی كۆڕی زانیاری ـ به‌غـــدا

١٤٢٢ی‌ك . ❋ ٢٠٠١ی‌ل .

# تقديم

من اهداف المجمع العلمي ، كما ورد في قانونه ، « الحفاظ على سلامة اللغة الكردية والعمل على نمائها ووفائها بمطاليب الحياة » •

والكتابة ، الى جانب النطق ، هما الوسيلتان اللتان تؤدي بهما اللغة مهامها في الوفاء بحاجات الانسان واداء متطلبات الحياة • ولئن كانت اللغة الكردية لم يتيسر لها بعد من يستطيع ان يحيط بقواعدها ويدونها في كتاب موحد أو كتب عديدة ولم تتوفر لها بعد اللغة الادبية الموحدة المدونة قواعدها وقوانينها وما تزال القضية دون ان تبلغ مراحلها الختامية ، والكرد ، كغيرهم ، يتحدثون بلهجات متعددة اساسية وثانوية ، لكل منها ، بطبيعة الحال ، قواعدها وقوانينها ، وزاد فيهم من تعقد الموضوع حياتهم في ظروف سياسية واجتماعية واقتصادية متنوعة حالت دون ما أشرنا اليه من موضوع تكوّن اللغة الادبية الموحدة ، فان الكتابة بلغة كردية موحدة ماتزال قضية بعيدة المنال ، بل ان الكتابة في لهجاتها المختلفة ، هي الاخرى ، بعيدة عن أن تسير وفق ضوابط متفق عليها يلتزم بها الجميع • وما يزال العديد من الحروف تكتب مع بعض اختلافات في الشكل • اما الكلمات ، ولاسيما المركبة منها ، ففي وضع أسوأ •

غير أن كل ما قلناه لا ينبغي ان يضع أمامنا لوحة قاتمة السواد ، سواء بالنسبة لتدوين قواعد اللغة او تقرير طريقة كتابة الحروف والكلمات . لقد اتخذت ، حتى الان ، خطوات في مختلف ديار الكرد في هذا المجال آثارها واضحة للعيان ، ولكن ما تحقق في كردستان العراق منذ انتهاء الحرب العالمية الاولى وبخاصة في الثلاثين سنة الاخيرة التي اعقبت صدور بيان آذار التاريخي في العام ١٩٧٠ ، قد غدا قدوة لكل ابناء الكرد اينما كانوا وحيثما وجدوا .

اننا اذ نحيي ذكرى الجنود المعروفين والمجهولين الذين قدموا خدمات جلى في هذا السبيل ، لا يسعنا إلا ان نشيد بالعمل الكبير الذي تحقق منذ تأسيس المجمع العلمي الكردي السابق وبعده في الهيئة الكردية التابعة للمجمع العلمي العراقي . ففضلا عما قرره المجمع العلمي الكردي السابق بهذا الشأن ، عقدت الهيئة الكردية في المجمع العلمي العراقي ندوة واسعة في اواسط الثمانينيات تمخضت عن جملة مقررات مهمة وعملية ، غير ان العديد من المشاكل القديمة ما تزال باقية إما لان القرارات السابقة لم تتضمن حلولا لها ، أو لان الحلول الموضوعة لم تزكها الحياة، او لان الكتاب لم يألفوا الالتزام بغير ما تعودوا عليه ، مما دعا الهيئة الكردية في المجمع العلمي في قوامها الراهن الى عقد ندوة اخرى خلال العام ١٩٩٩ وان لم تكن في سعة ندوتها الثمانينية السابقة . لقد كانت حصيلة الندوة الاخيرة البحوث الثلاثة التي القيت فيها والتي نقول عنها بصراحة انها ايضا دون ما نصبو اليه من ارساء متين نهائي بالنسبة للوقت الحاضر للكتابة باللغة الكردية .

ويسر الهيئة الكردية في المجمع العلمي ان تضع هذه البحوث ، اضافة الى بحث آخر كتبه في وقت سابق المرحوم رؤوف آلاني في الموضوع نفسه ، تحت تصرف العلماء والادباء والكتاب الكرد ، وكلنا امل في ان يكون هذا العمل دافعا للقضية خطوات اخرى الى امام بانتظار اليوم الذي تستقر فيه الكتابة الكردية في شكل محدد وتتيسر له الظروف لان يلتزم به الجميع . وعسى ان لا يكون ذلك اليوم بعيدا بفضل جهود المخلصين الغيارى ومساعدة الشرفاء الطيبين في عراق الوحدة الوطنية الصادقة .

والله من وراء القصد ..

**الدكتور جوامير مجيد سليم**
عضو المجمع العلمي
رئيس هيئة اللغة الكردية

# پێشــەکی

وەك لە قانوونی کۆڕی زانیاریدا نووسراوە ، یەکێ لــە ئامانجەکانــی کۆڕ « پاراستنی بێگەردیی زمانی کوردیو کارکردن بۆ گەشەپێکردنــیو توانی بەفریاداگەیشتنی داخوازییەکانی ژیانە » •

نووسینو گۆکردنیش ، ئەو دوو هۆیەن زمان لە ڕێگایانەوە ئەرکەکانی خۆی بۆ بەفریاگەیشتنی پێویستییەکانی ئادەمزادو هێنانەدیی خواستەکانــی ژیان ، بەجێدەگەیەنێ •

جا ، ئەگەر زمانی کوردی ، تا ئێستا ، کەسێکی وای بۆ نەڕەخســابێ شارەزای گشت بنەماکانی گرامەرەکەی بێو لە کتێبێکــی یەکگــرتوو یــا چەند کتێبێکدا بیانووسێتەوەو ، زمانی ئــەدەبیــی یەکگــرتووی بنەمــا نووسراوەو قانوون دارێژراوی تا ئەمڕۆ نەبێو ، مەسەلەکە تا ئێســـــتایش نەگەیشتبێتە قۆناغە دواییەکانیو ، کوردیش ، وەك گەلانیتر ، بە چەنــد دیالێکتی جیاجیای سەرەکیو لقەدیالێکت بئاخڤن ، کە هەریەکێکیان ــ وەك ئاشکرایە ــ گرامەرو قانوونی تایبەتیی خۆی هەیەو ، ژیانی کوردیش لــە بارو دۆخگەلێکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریی جۆربەجۆردا ڕێگــای لەوە گرتبێ کە ئەم زمانی ئەدەبیی یەکگرتووەی باسمانکرد پەیدا ببــێو بێتەدی ، دیارە نووسینیش بە زمانێکی کوردیی یەکگرتوو ، تائێســتایش ، وەك ئامانجێکی دوورەدەست ئەمێنێتەوەو ، دوور ئەبــێ لەوەی بەگوێرەی

بنەماگەلێگی هەمـوان پەسەندکـردووی‌وا بەڕێوەبچێ هـەموو لایـەنێ لەسەری بڕۆن • تائێستایش هەندێ پیتی‌وا مـاون بـە شـێوەی جیاجیا ئەنووسرێن • هەرچی وشـەو بەتایبەتـی وشـەی لە دوو پارچـە یا پتـر پێکهاتوویشە ، لە بارودوخێکی نالەبارتردایە • بەڵام دیـارە نابـێ ئەمـە تابلۆیەکی ڕەشی قەترانیمان ــ نە سەبارەت بە نووسینەوەی گرامەری زمانی کوردی‌و نە سەبارەت بە بڕیاردانی چۆنیەتیی نووسینی‌پیـت‌و وشەکـان ــ لەپێشدا دانێ • تائێستا لە هەرکام لە وڵاتانی کوردانەدا چەندین هەنگـاو لەم بوارەدا نراوە کە نیشانەی هەرکام لەو هەنگـاوانە زەقوزۆپ لـــە بەرچاومانە • بەڵام ئەوەی لەپاش بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهـانەوەو ، بەتایبەتی لەم سی ساڵەی دواییی پاش دەرچوونی بەیاننامەی مێژوویـی مارتی ١٩٧٠دا لە کوردسـتانی عێراقدا وەدی‌هـاتووە ، بووەتە پێشـەنگ‌و پێشەواو ڕێگا ڕوونکەرەوە بۆ گشت ڕۆلەکانی گەلی کورد لە هەر لایەك بن•

ئێمە لەکاتێکدا کە سەری نەوازش‌و قەدرلێزانین بۆ یادی هەموو ئـەو سەربازە ونو ناسراوانە نەوی دەکەین کە خزمەتی گەورە گەورەیان لـەم ڕێگایەدا پێشکەش کردووە ، لە توانماندا نیە ئەو کارە گەورانە پشتگوێ بخەین کە لە پێکەوەنانی کۆڕی پێشووی زانیاریی کوردەوەو پاش ئەویـش لە دەستەی کوردی سەر بە کـۆڕی زانیاریی عێراقـدا کـراون • ئەوەتـا سەرەڕای ئەو شتانەی کۆڕی زانیاریی کورد بڕیاری دابوون ، دەسـتەی کوردی کۆڕی زانیاریی عێراقیش لە ناوەڕاستی ساڵانی هەشتادا سیمینارێکی بەربڵاوی هەر لەم بوارەدا پێکەوەنا کە لەئەنجامیدا گەلێ بڕیاری پڕبایەخی کارەکی ( عەمەلی ) دران • بەڵام هێشـتا هەنـدێ گیروگرفتـی کـۆن‌و تازەداهاتوو هەر ماونەتەوە پێویستیان بە چارەسەرکردنە ، جا یا لەبەرئەوەی چارەسەریـان بۆ دانەنرابـوو ، یـا چارەسـەرە بۆبڕیاردراوەکانیان لـە تاقیکردنەوەی ژیاندا دەرنەچوون ، یا لەبەرئەوەی بنووسان خوویان بـــە

لەئەستۆگرتنی جێبەجێکردنی ئەو شێوانەوە زیاتر گرتـووە کـە هـەر لە منالّییانەوە فێریان بوون • ئەمەیش پالـّی بـە دەسـتەی کـوردی کۆڕی زانیارییەوە نـا سیمینارێکیتر لـە سـالّی ١٩٩٩دا بەستێ بـا نەیشتوانێ ئەوەندەی سیمینارە پێشووەکەی ١٩٨٥ی گەورەو بەربڵاو بێ •

ئەنجامی ئەم سیمینارەی دوایی ئەم سێ باسە بوو کە تیایدا خوێنرانەوەو، بێ‌پێچوپەنا ئەیلێین لەئاستی ئەو مەبەستە گەورەیەدا نین چاومان تێبڕیـوە ، کە ئەوەتە نووسینی کوردی ، بەش‌بەحالّی ئەمڕۆ ، بخاتە سەر شارێیەکـی تەختو پتەو •

دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری شادمانە ئەم باسانەو باسێکیتر کـە پێشتر خوالێخۆشبوو ڕەئووف ئەحمەد ئالانی لە هەمان بابەتدا نووسیویە ــ بخاتە ژێردەستی زانایانو ئەدیبانو بنووسانی کوردو ، بەهیواین مەسەلەکـە بەم باسانە چەندین هەنگاویتر بچێتە پێشەوە بۆ چاوەڕوانیی ئـەو ڕۆژەی نووسینی کوردی لە شێوەیەکی سەقامگرتوودا خۆی دەبینێتەوەو بـارو دۆخی ئەوەی بۆ فەراهەم‌دێ هەموان پابەندی ئەو شێوە سەقامگرتـووە بنو ، بەلّکو ئەوڕۆژەیش لە سایەی ڕەنجو تەقەلای دلسۆزانی بەغیرەتەوەو بە یارمەتیی هەموو مرۆ نیازپاکو بەشەرەفەکانی عێراقی یەکێتیی نیشتمانیـی ڕاستەقینەو ڕاستو دروست دوور نەبێو ، ئیتر دەست لە دەستو هێزیش لـە خواوە •

**د • جوامێر مەجید سەلیم**
ئەندامی کۆڕی زانیاری
سەرەکی دەستەی زمانو ئەدەبی کوردی
لە کۆڕی زانیاری

# دووباره لەگەڵ رێنووسی کوردی‌و گیروگرفتەکانی

د. نەسرین فەخری

ئەم کۆبوونەوەیە ، کە بۆ پێیداچوونەوەیە بەسەر رێنووسی کوردیداو چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی ماونەتەوە ، یان بیروراو بۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەیان ، یەکەم کۆبوونەوە نییـــە ، هەروەهـــا یەکـــەم هـــەوڵدان نییە ، بەڵکو هەوڵ‌و تەقەلای ساڵەهای ساڵە تا گەیشتووە بەم شێوەیـــەی ئەمرۆی ، ئەم هەوڵ‌و تەقەلایەش هی یەك‌و دوو کەس نییە ، بەڵکو هـــی چەندەها کەســـە لـــە نووســـەرو شـــارەزاو پســـپۆرەوە کە پاش هـــەر پێیداچوونەوەیەك بەسەر هەوڵی پێشتردا ، بەرەو پێشەوەترو پوختـــەتـــرو باشتر رۆیشتووە ، بە چارەسەرکردنی هەر گیروگرفتێکی‌تر ، کە هەســـتی پێ‌کراوە ، یان بەرگوێ کەوتووە ، یان هاتۆتە رێـــی ئەم‌و ئـــەو لـــەکاتـــی نووسین‌و خوێندنەوەدا .

واتا ئەم کۆبوونەوەیە دووبارەو بەوپێیە ، لەســـەر داوای هەندێـــك‌و لایەن‌و ، چەند کەسانێك ، کە مەراقی ئەم رێنووسەن‌و ، پێویستییان بـــە روونکردنەوەیەکی گشتی‌و زانستییانە هەیە ، سەبارەت بە وێنەی هەندێـــك دەنگ ( واتا پیت ) ، لەگەڵ چۆنێتی هەندێك وشەی ســـادەو ناســـادە ، چ سەربەخۆ ، چ لەناو رستەی هەمە چەشنەدا ، کە مشتومڕو رای جیـــاوازی

لەسەرە • لەگەڵ داواکردنی هۆو جۆری ئەو چارەسەر کردنانە ، تا بە پێی ڕوونکردنەوەیان بە بەڵگەو نموونەی زانستیی ئەوتۆوە بێت قەناعەتی تەواوی پێ بهێنن‌و لەسەری برۆن‌و بەسەریدا تێپەڕن ، نەك دووبارە سەرهەڵداتەوەو بگەڕێنەوە سەری ، تا بەوجۆرە روون‌و پڕبڕوایەش روونی‌کەنەوە بۆ ئەم‌و ئەو لە کاتی خۆی‌و شوێنی پێویستدا ، کە بەتایبەتیش ئەمە زور پێویستە بۆ ( قوتابیانی پلەی باڵای زمان )ی ئەمڕۆو مامۆستایانی سبەی ، بۆ فێرکردنی ئەم ڕێنووسە بەشێوەیەکی راست‌و یەکگرتوو لەپاڵ ڕێزمانەکەیدا ، چونکە لەوانەوە بەرەو خوارەوە ــ بەرەو پلەکانی ئامادەیی‌و ناوەندی‌و سەرەتایی دێتە خوارەوە •

لێرەدا بۆ یادکردنەوە سێ (٣) سەرچاوەی تایبەت بە ڕێنووسی کوردی دەخەینەروو ، کە تارادەیێك هەولو تەقەلای ساڵەهای ساڵ‌و رەنج‌و کۆششی ئەم‌و ئەو دەگرنە خۆیان •

یەکەم : کتێبی ( ڕێنووسی کوردی ) ( قسەکەر ) ، چاپی (١٩٧٧ ــ ١٩٧٨ ) ز زانکۆی سەلاحەددین ــ بریتییە لە (٧٩)و دیارە کە کتێبێکی ( منهجی )یە ، بۆ بەشەکانی زمانی کوردی بەگشتی •

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە لێرەوە دەست‌کراوە بە ئاوڕدانەوە لە ڕێنووسی کوردی‌و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە ، یەکەم کتێبێکە ( منهجی ) بێت‌و ، دانرابێت بۆ ئەو پلە باڵایە ، کە بێ‌گومان نیشانەیەکی هۆشیارانەو ، هەست‌کردنێکی تەواوە بە نرخ‌و گرنگیی ڕێنووس‌و فێربوون‌و فێرکردنی بەشێوەیەکی راست ، هەروەها بۆ یەکخستنی ئەو لایەنانەی بەجۆرێك زیاتر دەنووسرێن‌و هێشتا کێشەو بیروڕای جیاوازیان لەسەرە •

له لاپەڕە (٨٥) هەشتاوپێنجو بەدواوەی ئـەم کتێبەدا ، نـاوی (١٤) چوارده سەرچاوه هاتۆتەوه ، که تایبەتن به ڕێنووسی کوردی ، چ بەپیتـی عەرەبی ، یان لاتینی ، له ناوەوەی ولاتو دەرەوەی ولاتو ، لەلایـــەن چەندین شارەزاو پسپۆرەوه •

یەکەم سەرچاوه چاپی ( سالی ١٩٢٠ )ه ، لەلایەن ( محمد امین زکی )و ( ملا محمد باشقه )وەیه ، به پیتیلاتینی ، دوا سەرچاوه لەم کتێبی ڕێنووسەدا، ژماره (١٤) چواردەیەو به ناونیشانی ( ڕێنووسی کوردی لەسەدەیەکـدا )ی ( حامد فرج )ه ، چاپی کـوڕ ، سـالی (١٩٧٦) • سـەرنج بـدەنه ( لـه سەدەیەکدا ) • لەگەل (١٠) ده سەرچاوەیتر ، که باسی ڕێنووسیان تێدایه ، دووباره لێرەو له چەندەها شوێنیتر له دەرەوەی ولات •

بەکورتی : نازانین ناوەرۆکی ئەم ڕێنووسه چۆن وتراوەتەوه ؟ ئایـــا تائێستا هەر لەکاردایــه ؟ ئەوانەی دەیلێنـــەوه ، یان وتوویانەتەوه ، تـا چرادەیەك شارەزاو ئاگادارنو تواناى ئەوەیان هەیه که بەرپرسیار بوونەوه وەلامی بەجێبدەنەوەو ، نەك تەنیا خاوەن پرسیار بەلکو گشت گوێگرەکان ئەو وەلامه پەسەند بکەن ؟ هەروەها ئایا وەلامەکـەی لەگـەل ناوەرۆکـی ڕێنووسەکه ، یان خاوەن پرســیارەکه یـەكدەگرێتەوه ؟ ئایا بـیر ، بیروڕای تایبەتی خۆیەتی ــ که مەرج نییه بچێته سەر ؟ یان بەلگەی وردو زانســتیی لـه پالدایه ؟

له (١٩٧٨ــ) تائێستا (٢٠) سال زیاتره ئەم کتێبه دانراوه ، نـەدەبـوو مامۆستاکه تێبینی خۆیو قوتابیـان کۆبکاتەوه ــ ئـەو تێبینیانـەی کـه پێویستییان به ڕوونکردنەوه هەیەو نەبڕراونەتەوه ؟! بێ گومان لـەم (٢٠) بیست سالەدا چەند مامۆستا گۆڕراوەو چەندو چەند له قوتابیان ئەو پلەیەیان بڕیوه ؟! ــ ئینجا به نووسراوی بگەیێنرایەته دەست خاوەن کتێبو ، ئـــەو لایەنـەی کتێبەکـەی لـه چـاپداوه ، تـا بەشـێوەیەکی باشترو ڕاستر

لەچاپبدرایەتەوە ؟ یا تەنیا حازرین بۆ قسەو باسی ناوخۆ ، بەڵام لە کاتی شوێنی خۆیدا ، یان ئەو خەڵکە قوڕوقەپیانە ، یان ونو بزرن ؟! یان دیارە ئەوەی هەیە وەك ( بیبی ــ مەتتۆ ــ بەبەغا ) دەوترێتو دەوترێتەوە •

لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا دانەر نووسیویەتی :

« ••• راست نووسین بەڵگەی شارەزاییو زانینە ، نەك راهاتنو فێربوونە بەو شێوەیەی پێی دەنووسین •• ، بەڵگەی شارەزاییو زانینی رێزمانو دەستووری زمانە ، هەروەك شارەزایی لە رێزماندا •• رێگەی راستنووسینمان بۆ خۆش دەکاتو ، لەژێر تیشکی زانستیدا ئەو هەڵەو ناتەواوییانە دەدۆزینەوە کە تووشمان دێن » •

کەواتە پێوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوانی زانینی رێزمانو راست نووسیندا • ئەم پێشەکییەش (٥) پێنج لاپەڕەیە ، کە باس هەر باسی رێنووسو نرخی راستنووسین دەخاتەروو •

دوو : چاپکراوی دووەم ( رێنووسی کوردی بە پێی بڕیارەکانی کۆڕی زانیاریی ــ عیراق ــ دەستەی کورد)یە ، سالی (١٩٨٧) ، ( هەفتاویەك ــ ٧١) لاپەڕەیە • لە پێشەکییدا نووسراوە :ــ « رێنووسی یەکگرتوو نیشانەی یەکێتی بیرو بۆچوونی هەموو گەلێکی پێشکەوتووە ، کە زمانی نەتەوایەتیی خۆیان بۆ لەیەكگەیشتن لە هەموو کۆڕەکانی ژیاندا بەکاردەهێنن ، چونکە بەهۆی ئەو رێنووسەوە ، کەلەپوورو بەرهەمی هاوچەرخو ئاواتی دوارۆژ ، نەوە دوای نەوە دەمێنێتەوەو ، بە وێنەیەکی یەكگیر رزگار دەبێتو ، تۆمار دەکرێت••••» ، تا دێتە سەر باسی (مێژوونووسی) کە ــ چۆن ــ بەدوای چۆنێتی لەدایكبوونی رێنووسی یەکگرتووی میللەتاندا دەگەڕێ ، تێبینی دەکات ، کە ئەم ئاکامە نەتەوایەتییە یەکسەر وەدەستنەهێنراوە» ، تا دێتە سەر هۆی ئەو کۆڕەی لە (١٨ــ١٩/١٢/١٩٨٥) گیرا لەژێر چاودێریی کۆڕی زانیاریی عیراقداو لە هەمان مەڵبەندی ناوبراودا ، بە وێنەیەکی ئێجگار

بەربڵاو لەرووی ژمارەی ئەندامانو نواندنی زارەکانی زمانی کوردیو ڕەنگاورەنگیی پسپۆریەتیو ، بۆچوونو ژمارەی بەرپرسیارانو دەزگا کوردییەکان •

هۆکانی ئەم کۆڕەش ئەمانە بوون :ـ

یەکەم : ڕێنووسی کوردی بەگشتی لە نووسەرێکەوە بۆ نووسەرێکیدی جیاوازە •••

دووەم :ـ هەوڵو تەقەلای زاناو پسپۆری کورد ، ••• بەکارێکی کەسی لەقەڵەم دەدرێ •••

سێیەم :ـ بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی ئەو نووسەرانەی ، کە بە دەنگ بانگەوازەکەوە هاتن ••

چوارەم :ـ ڕێکخستنی بۆچوونی ئەو نووسەرانە ، کە هەوڵی چارەسەر کردنی ئەم خاڵانەی خوارەوەی داوە :ـ

یەك :ـ گیروگرفتی دەنگەکان •

دوو ـ وشەی سادەو ناسادەو گیروگرفتەکانی

سێ :ـ گیروگرفتی راناوی لکاو لەگەڵ فرمانو ئامرازی (عەتف ـ عطف)ی (و)و (ش)و ، ئامرازی ئیزافەی (ی) •

چوار :ـ گیروگرفتی نووسینی وشەی عەرەبیو خاڵبەندی •

کارەکەی ئەم کۆڕە هەروەك لە کورتە خاڵەکانی سەرەوەدا ڕووندەبێتەوە ، زۆر بەر فراوانو بەسوودو باش بوو ، کە پێویست بوو ، پێرەو بکرێت ، بەپێی یاسای کۆر ، پاش بڕیاردان لەسەری بەشێوەیەکی (ڕەسمی) • ئەمە نەهاتەدی ، بەلام هەندێك بەپێی قەناعەتیان پێرەویان کردو ئەوانیتر ( هەروەك با بەلای گوێیاندا تێپەڕی ، بەبێ ئەوەی بلێن بۆ (ئا) یان بۆ (نا) ـ ئەمەش یەکێکە لە دەردەکانی ناوخۆمان •

بەلاّم پێویستە لێرەدا ئەوەش بخەینە پێش‌چاو ، کە ئەو گیروگرفتانـە لەسەداسەد (١٠٠٪) نەبڕراونەتەوە ، بەلاّم رای زوربەی بردۆتەســـەر ، بەندەش یەکێکە لەوانەی کە لەگەڵ هەندێك لەو بڕیارانەدا نیم ، چونکە نەك زۆر بێت‌و بۆر بیت ، بەلکو جۆر نەك ژمارە لێرەدا مەرجـەو ، دەبێـــت دەوری خۆی ببینێت ، هەروەها لەگەڵ بەشێك لەو ئەنجامانەشدا نیـم ، نەك لەبەرئەوەی رای تایبەتیی خۆم هەیە ، بەلکو بەپێی بەلگەی زانستی •

لێرەشدا بۆ درێژە پێ‌نەدان‌و ماوەدان بە ئامادەبووان ، ئەو تێبینیانەی خۆمان خستۆتە ئەولاوە بە ئامادەکراوی ، تا بەپێی پرسیارو پێویســـتی بیان‌خەینەروو • چونکە هەندێك لەوانە ( یەك‌و دوویان ناوێت) چونکـــە ئەوەندە روونن خۆیان وەلاّمی خۆیان دەدەنەوە لەژێر تیشکی زانســـتیی زماندا ، بەکورتی‌و تەنیا بۆنموونە (راناوی لکـــاو) ، (ی) ئیزافـــە ، (و)ی (عەتف) ، وشەی دارێژراو (بەیاریدەی پێشـــگرو پاشـــگر)و ئەو وشـــە لێکدراوانەی یەك واتای سەربەخۆو جیاواز دروست‌دەکەن‌و ، ئەو وشـانەی بە رووالّەت یەك‌و لە واتاو ناوەرۆك جیاوازن : ــ بۆنموونە :ــ

پێش‌کەوتن (فرمان ــ کەوتن)ەو (پێش) ئاوەلکارە ، پێشـــکەوتـــن ــ (تقدّم) دژی (پاشکەوتن)ە هەروەها ــ پاش کەوتن ــ هەستم بە ئازارکرد ، پاشکەوتـــن بەلگەی نەفامـــی‌و کەم‌تەرخەمییە ، پێ‌داهێنـــان ــ (فرمـــان ــ داهێنان)ە ، (بە ئەو داهێنان) ، پێداهێنان ــ (دەستی بـــە سەریدا هێنـــا) ، پێ‌کردن (فرمان ــ کردن)ە = بە ئەوکردن ، پێکردن ــ هەلکردن ــ ە چراکەم هەلکرد = پێکرد ، ئیشەکەم پێ‌کرد × چراکەم پێکرد هتد ••

دەنگی دوو (ر)و دوو (ل)و دوو (وو) لەوە روونترە کێشەی لەســـەر بکرێت ، یان (دیفتۆنگ)و (پیت) لە یەك جودا نەکـــرێنەوە ؟••• دیـــارە ئەنجامی نەشارەزایی‌یەو بەلگەی ئەوەشە کـــە هەروەك هەر مەیدانـــە ــ مەیدانی زانستی ، پسپۆرو زانای خـــۆی هەیە ، رێنووسیش زانستە ، وەك

ڕێزمانو ، هەریەکە تیشکی ڕوونکـردنەوە دەخاتـە ـ سەر ئەوی تـرو ساغی دەکاتەوە ، واتا نە ڕای ئەمو ئەوو ، نە ڕاهاتنـەو نە فێربوونو ، نـە هەرکەسەش بێتو خۆی تێ هەڵقورتێنێت ، مافی ئەمانە تەنیا لەوەدایە بپرسنو داوای ڕوونکردنەوە بکەن دەربارەی ئەمو ئەو کامیان ڕاستەو کامیـان هەڵەو بۆ ؟ یان کامیان ڕاستو کامیان ڕاسترەو بۆ ؟

چاپکراوی سێیەم : (نووسەری نوێ)یە ، کە ژمارە (٧) حەوتی تەرخان کردووە ، بۆ (سمیناری پەرەپێدانی زمانی کوردی) ، واتـا ژمارەیەکـی تایبەتییە بەم سمینارەو چاپی کانوونی یەکەمـی (سـاڵی ١٩٩٨) زایینـەو ، ژمارەی بەشداران لەم سمینارەدا (٦٨) کەسن •

جۆری بەشدارییان چۆن بووەو چۆن دابەشکراون بەسەر هەر لایەندا ڕوون نییە ؟ ، هەروەها ـ بەرپرسیار (کە شارەزا یان پسپۆران) دەگرێتەوە ، لەگەڵ ئەوانەدا کە دووچاری لێپرسین دەبنو پێویستییان بەم کۆبوونەوانە هەیە ، لەگەڵ ئەوانەشدا کە نووسەرنو دەیانەوێت لەگەڵ هاونووسـەران ڕێگەیەکی یەکگرتوو بگرنەبەر ، یەك لەبەر خۆیانو دوو لە پێنـاوی ڕاژەی زمانو میللەتەکەیدا ، چونکە هەرکەسەو جۆرە نووسینێك لە نووسەرانـدا جێی نارەزاییو نەفامی دەردەخات ، لەپاڵ سەرسوڕمان •

ئەم سێ (٣) بەشە ڕوون نینو تێکەڵن لەم سـمینارەدا • چونکـە بەرێوەبەرو بەشدار بوو پێویستە پسپۆری ئەو کۆڕە بێـت ، ئەوانەش کـە وەك وتمان دووچاری ئەو کارەنو بەرپرسیار دەبنـەوە ، پرسیارەکانیـان لەپێشەوە ئامـادە کردبێـت ، هەشە گـوێ دەگـرێتو فێـر دەبێت بـۆ ڕاستکردنەوەی ڕێنووسی خۆی ـ لەناو ئەو ناوانەدا هیوای تێدایە کە لـە جێی خۆیاندان ، هیواشی تێدایە دوورو بێئاگانو ، لەگەڵ ئەوەشدا (ڕای) ناتەواوی خۆیان بە تەواو زانیوەو وەك دیارە سووریشن لەسەری ، ئەوەی بەم ژمارەیەدا بێتەوەو ، لە ناوو ڕاکان وردبێتەوە ئەمەی بۆ ڕوون دەبێتەوە •

له لاپەڕە (٢٥)ی ئەم ژمارەیەدا کە بە ناونیشانی (ڕێنووس)ە ، دێڕێــك نووسراوە دەڵێت :ــ (ئێمە هاتووین ، خزمەتی زمانــی کــوردی بکەین)• جوانەو لەجییەو ئاواتی هەموو دڵسۆزێکە لەم بوارەدا • ئینجا دێتەســەر ئەم وتەیە : (هەر برادەرێك چ بۆچوونێکی دەربارەی جۆری دانیشتنەکــان هەیە بیان خاتە ڕوو) • زۆر لەجێیەو باشە بەمەرجێك ئەم برادەرو ئەو برادەر شارەزا بن‌و شارەزاییەکی زانستانە •

یەکێك لەوانەی ئاگادارن‌و لە بەشداربووەکانی کۆبوونەوەی کــۆڕی زانیاریی عیراق ــ دەستەی کوردی بوون ــ مامۆستا (شکور مستەفا)یــەو دەڵێت (ئێمە کۆمەڵێك موعەلەقمان هەیە••••) ئایا ئەو کۆمەڵە چەندە ؟ چییەو بۆ ؟ بەشێك لەو (موعەلەقانە) خۆمان (موعەللەقمان) کردووە ، بەداخــەوە کە ئەمەش یەکێکە لە دەردەکانمان ، هەروەها دەڵێت : (ڕێزمان تێکەڵ بــــە ڕێنووس نەکەین) ••• کــە بەڕاســتی سەیرەو وەڵامــی ناوێت • یان دوو (و) = (وو) هەبێت یان نەبێت عیلاقەی بە مەسەلەکەوە نییە ؟ چۆن نازانین ؟! (کووڕ) (و)ی درێژەو (هەژار) هەمووی بە یەك (و) دەنووسێت • منیش لەم رایەدام ، (هەژار) ئەگەر کەڵەشاعیرو زمان پاراوو شارەزا بووچ پێوەندییەکی بە (ڕێنووس)ەوە هەیــە ، تۆش کــە (کــووڕ)و (کوڕ)و (قووڵ)و (قڕل)و (نوستن)و (نووسین) بە یەك (و) بنووسیت دەبێت چۆن وەڵام بدرێیتەوە ؟!• یان کە دێتەسەر (پێ‌لێ‌داگرتن) هەموویان ، واتا یەك بە یەك بە بێ (واتــا ــ مەعنا) دادەنێت ــ کە هەڵەیەو هیوادارین هەڵەی چاپ بێت ، ئەگینـــــا شارەزا شتی وا ناڵێت •

ــ سەیر ئەوەیە خۆی ئەندامی باڵاو یەکێــك بوو لــە پوختەکەرانــی بۆچوونەکانی کۆڕی (ڕێنووس) •• دان بە پسپۆرو خــاوەن‌شــەهــادەی دکتۆرادا ناهێنێت‌و رای خۆی ــ کە را ناخوات لەم شوێنانەدا ــ لە ســەرووی هەموو شتێکەوەیە • ئەمەم هێناوەتەوە بۆ نموونەو بۆ نەگبەتی • ئیتر ئــەم

دەڵێت یەك (و)و ئەو (دوو) ، ئەم لابەین‌و ئەو نا •• بە هـەوەس • ل (٣٠) خەڵکی سلیمانییە ــ سلێمانییتییە ــ کە وا ناگوترێت بەڵکو سلێمانەیی‌یە ، وەك ــ هەڵەبجەیی ــ باداوەیی ــ بانەیی هتد •• تا (٣١) ــ بـــەڵام د • فەرهاد پیربال ــ دانی بەوەدا ناوە کە ئەو گیروگرفتەی لە زمانی ئێمـــەدا هەیە لە زمانی‌تریشدا هەیە ــ فەرەنسیی باسکردووە • بۆ عەرەبی نییەتی ؟! (بەتایبەتی لەچاپەمەنیداو بەکارهێنانی ژێرو بۆرو فتحەو شدّە)دا ؟! •• بەڵام پردوویانەتە سەر • (ق • د • م قدم/ج • م • ل جمل ) لەکاتێکدا ئـــەوی شارەزا نەبێت ــ قِیمّە وقـَمّە ــ تێکەڵ دەکات ••

بیان نووسین بە لاتینی ــ (و)و (ی) بزوین‌و کپ کە یەك رووالەتیـان هەیە لەوێدا دوو وێنەی جیاوازیان هەیە لە لاتینیدا •

ل (٣٣)و وشـەی (خانوو) ــ• خانـووەکـە ــ بـە سـێ بزوێن لەقەڵەمدراوە •

د• مارف خەزنەدار ــ ئیشارەتی بۆ مامۆستا تۆفیق وەهبی کـردووە کە لە (١٩٥٧) گیروگرفتەکانی رێنووسی چارەسەرکردووە ، لە زنجـیرە وتارێکدا (زمانی کوردی لە توێکڵە گوێزێکدا) • دێتە سەر زمانی عەرەبی‌و گیروگرفتەکانی‌و بەلاشیەوە سەیرە (دەنگ‌و زاراوە) بخرێتە دەنگدانەوە ؟!!

یان کێشە لەسەر (ی)ی ئیزافە ــ ؟ بۆ ؟ قازی ناو •• قازیی شار •

ئینجا وشەی (دارێژراو) واتا لەگەڵ پێشگرو پاشگردا • چـــۆن بنووسرێن • ئەوی شارەزا بێت دەزانێت چۆن •

ئیشەکەم پێ‌کرد ــ چراکەم هەڵکرد • ئەویان (کردن)و ئەمیان (پێکردن) پێکرد ــ لیستەیێك بە کۆمەڵە وشەیەکی لەم جۆرەم ئامادە کردووە •

ــ ئینجا ل (٣٩)و (چی‌و چ ــ تێکـەڵ کراوەو بەجـودا یان تێکـەڵ بنووسرێت • ئینجا (ئەمساڵ‌و ئەمسال ــ ئەمرۆ ••) و ــ بازدان بۆ ئیدیەم‌و•

ل (٤١) دەستڤوێژو دەسنوێژ ـ دەست ـ دەس ـ بە پێشگر دادەنێت ، لە جیاتی هۆی لادانی (ت) دەرخات ، وەك دەسماڵو دەسەسڕ ـ ، بۆ لە(دەستاردا) وا نییە ـ تا ل (٥١)

بەکورتی ـ جۆرە گێرەشێوێنییەك لەو کۆبوونەوەیەدا دیارە :

١ ـ دەبوو ـ پسپۆرو شارەزایان لە زمانو ڕێنووسدا لەوانیتر جودا بکرێنەوە •

٢ ـ ئامادەبووان ئەوانەی پێویستییان بەو ئەنجامانەو ئەو تێبینیانە هەیە لە کاروباری خۆیاندا ـ هەریەکە ـ تێبینی خۆیو پرسیارەکانی ئامادە ـ بکردایە • نەك بە سەرپێییو تێکەڵو پێکەڵ بێت •

٣ ـ دەبوو بە ڕێكوپێکی چیکراوەو چی چارەسەر کراوە دووبارە ـ هەڵنەوەشێنرێنەوە ، دوان لەسەر ئەوە بێت کە ماوەتەوە بە ئامادەکراوی بخرایەتەروو ، ئینجا چارەسەرکردنی لەژێر تیشکی زانستی زمانداو لەرووی ڕێزمانەوە ، نەك بە رای ئەم ئەو •

واتا لەوانەی لە کۆبوونەوەی کۆردا بەشدار بوون ، بەتایبەتیش ئەوانەی ئەندامی ئەو کۆڕە بوون دەبوو لەوێوە دەستپێبکەن نەك ریسبکەنەوە •• بە خوری ، من لێرەدا کۆتایی بە قسەکانم دەهێنمو ئامادەم بۆ وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێك • بەڵام خۆشم ئەم پرسیارە دەکەم لە ئامادەبووان ئایا هەر وا هاتوون ـ یان خۆیان ئامادە کردووە بۆ ئەم هاتنە ؟! هەروەها پاش ئەم کۆبوونەوەو وتووێژە بۆ کوێو ؟ بەرەو کوێ ؟

کۆبوونەوەو رووبەروو بوونەوە کارێکی باشو بەسوودە بەمەرجێك ـ مەرجی سەرەکی خزمەتی گشتی بێت ، کە زمانی میللەتەکەیە • دوو فێر بوون لەیەکەوەو وەرگرتنی شتی راست بەڵگەی رۆشنبیرییەو دەست لەناو دەستی یەکدییە لەپێناوی راژەی گشتیدا • ئایا کەی دان ـ بەم راستییەدا دێنین ؟!

یەکشەممە ١٩٩٩/١٠/٢٤

# بە دەوروبەری چاككردنی شێوەنووسینی كوردییا

محمدی مەلاكریم

بەر لە هەرچی با ئەوە بڵێم كە مەبەستم لە ئیستیلاحی (شێوەنووسین) ئەوەیە لەناو ئەوانەدا بەم بابەتەوە خەریكن ، پێیی ئەڵێن «ڕێنووس» • من ئیستیلاحی (ڕێنووس)م بەلاوە هەڵەیە ، وەك (زاراوە) خۆیشیم ، بە واتای (ئیستیلاح) ، بەلاوە هەڵەیە • لەوانەیە برادەرێ لەولاوە ڕاست بێتەوە بلێ : ئەی بڵێین چی ؟ لە وەڵامیا ئەڵێم : ئەبێ وشەیەكیوای بۆ بدۆزرێتەوە یا بۆ دروستبكرێ واتاكەی بەتەواوی بگەیەنێو بەپێیی ڕێوشوێنەكانی زمانی كوردییش داڕێژرابێ • (ڕێنووس) ، بە كوردییەكی ڕاستو ڕەوان ، واتە : كەسێ كە (ڕێ ئەنووسێ) ، وەك (دوعانووس) واتە : كەسێ كە دوعا ئەنووسێو (عەرزوحاڵنووس) واتە : كەسێ كە عەرزوحاڵ ئەنووسێ • یانێ چی : (ڕێ ئەنووسێ) ؟ نازانم ! ڕێ چۆن ئەنووسرێ ؟ ڕێ نانووسرێ ، ئەكرێتەوە ، ئەدۆزرێتەوە • خەڵك ڕێیەك ئەكەنەوە یا ئەدۆزنەوە بەزوویی‌و بەئاسانی بیانگەیەنێتە جێیەك • ئەوانە ڕێیان كردوەتەوە یا دۆزیوەتەوە • ئەوەی وشەی (ڕێنووس)ی داناوە ، دیارە مەبەستی (ڕێگای نووسین) بوە ، واتە : ئەو ڕێگایەی لە نووسینا ئەیگرتەبەر • (ڕێنووس)یش ئەو واتایە ناگەیەنێ • هەروا (زاراوە)یش كە لە (زار)و (ئاو) پێكهاتوەو تێكرا واتە : (ئاوی زار) ، واتە : هەمیشە بەسەر زمانەوەیە • بەلام ئیستیلاح هەمیشە بەسەر زمانەوە نیەو لە شوێنی تایبەتیدا نەبێ بەكارناهێنرێ • نازانم

ئەوەی ئیستیلاحی (زاراوە)ی یەکەمجار بۆ ئەم واتایــە بەکارهێنــاوە ، وای بیرکردوەتەوە کە من ئێستا لێرەدا نووسیم یا بە جۆرێکیتری بیرکردوەتەوە ؟ ئەمەی من بۆچوونی خۆمەو ئاواتەخوازم خاوەنی یەکەمی وشەکەیش ، ئەگەر ماوە ، ئەوەمان بۆ ڕوونبکاتەوە کە چۆنی لێکداوەتەوە • ئەگەر پێوەندی (زاراوە) بە (ئیستیلاح)ەوە ئەمە بێ کە من بۆی چووم ، لاموایە پێوەندێکی دوورەو بە ڕاستو دروستی نازانم[1] • جا بۆیە لێمببوورن ئەگەر بڵێــم بەشێکی زۆری ئیســتیلاحەکانمان کــە ئێســتا لە کۆلێــژو خوێندنگــاو قوتابخانەکانمانا بەکارئەهێنرێن ، لەم بابەتەنو ، ئەمەیش زیانێکی گــەورە بە دوارۆژی زمانو خوێندەواریو زانستمان ئەگەیەنێ • من لاموایە چارەی ڕاستی ئەم گیروگرفتە ، هەر هیچ نەبێ لەم قۆناغەی ئێستامانا ، بە بەکارهێنانی ئیستیلاحە زانستیە جیهانیەکانە کە لە بەشێکی زۆری زمانەکانی جیهانــا بەکارئەهێنرێنو ، هەر گەلێ تووشی تەنگەجیکڵدانەیيو دەمارگیریــــی وشکەنەتەوەییەتی نەهاتبێ ، بیر لەوە ناکاتەوە وشەی بە زمانی خۆی بــــۆ

(١) لە فەرهەنگە کوردیەکانا گیوی موکریانی لە (فەرهەنگــی مەهــابــاد)و ، شێخ موحەممەدی خاڵ لە ( فەرهەنگی خاڵ )و ، فاضل نیظامەددین لــــە (گەنجینەزرێرینە)دا (زاراوە)یان بە واتای (اصطلاح ، مصطلح) لێکداوەتەوە. د. جەمال نەبەزیش نامیلکەیەکی بە ناوی (زاراوەی زانستی)یەوە هەیە . هەژاریش کە فەرهەنگی (هەمبانە بۆرینە)کەی پاش هەموو ئەو سەرچاوانە لەچاپداوەو دیارە هەموویشیانی لە بەردەســتا بــوە ، بــە « شــێوەی تایبەتیی ئاخافتن ؛ دەراوی دەم ، زاراو »ی مەعنا لێداوەتەوەو باســــی (اصطلاح)ی نەکردوە . وا پێدەچێ یەکەم سەرچاوە ئەم وشـەیەی بــەم واتایە گرتبێتە خۆی ، (فەرهەنگی مەهاباد)ەکەی گیوی موکریانی بێ . دوور نیە ئەویش لەوەوە بۆی چووبێ کە لە دیالێکتی موکریانــدا بــــە (دەم) ئەڵێن (زار)و خۆیشیان ــ ئەوو حسێن حوزنی موکریانیی کاکی ــ گۆڤارو چاپخانەیەکیان بــە نــاوی (زاری کرمانجی)یەوە بوە . دوور نیە شێخی خاڵو د. جەمال نەبەزو فاضل نیظامەددینیش هەر لە گیویــان وەرگرتبێ .

هەر ئیستیلاح‌و وشەیەکی تازە داهاتوو دانێ • جا ئەگەر خوا کـــــــردی‌و ڕۆژێ لە ڕۆژان دامودەزگایەکی تایبەتیی خۆمانمان بـوو و فەرهەنگـــی یەکەیەکەی دیالێکت‌و وردە دیالێکتەکانی زمانەکەمان نووسراو ، پـــاش ئەوەیش فەرهەنگی یەکخراوی سەرلەبەری دیالێکتەکانــی زمـانەکەمـان نووسراو ، فەرهەنگێکیش دانرا واتای ئەو ئیســتیلاحە جۆربەجۆرانــەی ، بەکوردی ، تیا لێکدرایەوە کە هاتوونەتە هەر سەرێکی ژیانمانەوە ، ئەوکاتە ئاسان ئەبێ شارەزایانی زمانەکەمـــان ، هاوکار لەگـــەڵ زانایانی گشـــت بابەتەکان ، لەسەر بنەمای واتای گشت ئیستیلاحە داهاتوە جیهانیەکـانو گەڕان بەو فەرهەنگە بەربلاوە هەموو وشەکانی زمانەکەمان ــ گرەوەداو : بەگوێرەی گرامەری زمانی کوردی ، وشەی لەبار بۆ گەلێ لەو ئیستیلاحانە بدۆزینەوە یا داتاشین کە ئێستا پەکمان لەسەریان کەوتوەو ئەم وشەگـــەلـە غەڵەت‌وپەڵەتانەیان بۆ داتاشراوە •

با لە بابەتــی کۆڕەکەمـــان لانەدەین‌و بگـــەڕێینەوە سەر مەبەستـــی سەرەکیمان‌و ، وا من لەم سەرەتایەوە دەستپێ ئەکەم :

خراپ نیە ئەگەر ئەوە بێنینەوە یاد کەوا پاش بلاوبوونەوەی ئاینـــــی ئیسلام لە کوردستانا ، هەر جۆرە نووسینێ پێش ئیسلام لە کوردســــتانا بووبێ ، کە وەك دەرکەوتوەو دۆزراوەتەوە جۆرێکیشیان نووسین بوە بـــە کۆمەڵێك پیتی تایبەت بە کوردان بە زمانی کوردی پێیـــان نووســـــراوەو تەنانەت کتێبی پڕبایەخیشی بە کوردی پێ نووسراوە[۲] ، تا ماوەیەکی کـــەم نا ئەوجۆرە نووسینانە ماونەتەوەو ، پاشان بە موسوڵمانبوونی بەشـــــی

---

(۲) بڕوانەرە : محمدی مەلاکریم ، کوردیش کاتی خۆی پیتی پێنووســـینی خۆی هەبوە ، گۆڤاری «ڕەنگین» ، گۆڤارێکی مانگانەی سیاسیی گشـتیە دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە وەزارەتی ڕۆشـــنبیری‌و ڕاگەیاندن دەریدەکات لە بەغدا ، ژمارە ۱۱۷ ،تشرینی یەکەمی ۱۹۹۸ .

هەرەزۆری کوردان نووسینی کوردیو نووسین بە پیتی کوردیو بە هیچ جۆرە پیتێکیتری پێش ئیسلام لەناو کوردانا نەماوەو ، نووسین بە عەرەبی بوە بە نووسینی تاقانەی ئەو کوردە موسوڵمانانەی توانیویانە بنووسنو بخوێننەوە •

پاش ماوەیەکیتریش کە فارسەکان وریابوونەتەوەو دەسیان داوەتە نووسینی زمانەکەیان بە پیتی عەرەبیو وردەوردەیش دەسکاریەکی کەمی هەندێ پیتی عەرەبییان کردوە تا زیاتر لەگەڵ دەنگی فارسی بگونجێ ، نووسین بە زمانی فارسیو بە پیتی عەرەبی لەناو کوردانیشا بڵاوبوەتەوە • پاش ئەمە ، وەك چۆن فارسەکان هەستیان بەوە کردوە کە شێوەنووسینی عەرەبیو بە پیتی عەرەبی بەتەواوی لەگەڵ سروشتی دەنگی فارسی ناگونجێ ، کوردەکانیش ، پاش ئەوەی دەسیانداوەتە نووسینەوەی شیعری کوردی بە پیتی عەرەبیو بە شێوەی فارسی ، ئەم هەستەیان لەناوا پەیدابوەو وردەوردە کەوتوونەتە جۆرە دەسکاریکردنێکی شێوەنووسینی عەرەبی بە پیتی عەرەبی بە یارمەتیی ئەو ئەندازە دەسکاریەوە کە فارسەکان لە پیتی عەرەبییا کردوویانە • بۆ نموونە : ئەمانیش ، وەك فارسەکان ، دەنگی (پ)و (چ)و (ژ)یان بەو شێوەیەی ئێستا پێی ئەنووسرێن ؛ نووسیوەو ، لەوانیش زیاتر دەنگی (ڤ)یشیان خستوەتە قاڵبی پیتێکی تایبەتیەوەو لەمەیشا چاویان لە چۆنیەتیی دروستکردنی پیت بۆ دەنگی (پ)و (چ)و (ژ) کردوەو هاتوون یەك نوختەکەی (ف)یان کردوە بە سێ نوختەو کردوویانە بە (ڤ) ، وەك چۆن یەك نوختەکەی (ب)و (ج)و (ز) کراون بە سێ نوختەو دانراون بۆ (پ)و (چ)و (ژ) ، بەڵکو لەمەیش زیاتر ڕۆیشتوون کە تائێستایش فارسەکان هەر لە شوێنی ئەو کاتەیانا گیرساونەتەوەو ، وردەوردە شێوەی

(ه ــ ە)یان کردوە بە نیشانەی (بزووت)[٣] ــ یا وەك ئێستا بەهەڵە ئەڵێــن (بزوێن)[٤] ــ ی سەر واتە (فتحة)و ، پاشتریش (و)یان کردوە بە نیشــانەی بزووتی بۆر واتە (ضمة)و ، (ی)یان کردوە بە نیشانەی بزووتی ژێر واتــــە (کسرة)و ، تادوایی[٥] ، کە ئێمە ئێستا کۆمەڵێ نیشانەی زیاترمان بۆ پیتــە عەرەبییە بەکوردی بەکارهێنراوەکان داهێناوەو ، تێکڕای پیتی گیراو ، واتە (مشدّد) ، بە دووبارە ئەنووسین‌و ، بۆ هەندێ دەنگ نیشــــانەیەکی وەك ژمارەی (٧) لەسەر یا ژێری پیتەوە دائەنێین‌و ، هەمزە لەســەر کورســـی ئەنووسین کە نە عەرەب لە شێوە نووسینی ڕاستیاناو نە فارس شتی‌وایــــان نەکردوەو ، (و)ی درێژ بە دوو (و ــ وو) ئەنووسین •

---

(٣) ئەم وشەیە من خۆم لە چاوگی (بزووتن)م داتاشیوەو هەر (بزووتن)ەکەیە (ن)ەکەی پاشەوەیم بۆ ئاسانیی بەکارهێنان لابردوە وەك چون (پێشکەوتن) بۆ ئاسانیی بەکارهێنان کراوە بە (پێشکەوت). هەموانیش ئەزانن (بزووتن) واتە (حرکة) .

(٤) (بزوێن) لە کوردیدا ئیسمی فاعیلەو بەعەرەبی واتە (محرّك) . ئــەوەی یەکەم‌جار بۆ واتای (حرکة)ی داناوە لە واتاکەی وردنەبوەتەوەو کەوتوەتە هەڵەیەکی زەقەوە . پێویستە لەسەر بەرپرسانی دانان‌و وەرگێڕانـــی کتێب بۆ قوتابخانەکانی کوردستانی عێراق ئەم هەڵەیەو دەیان هەڵەی‌تری ئەو کتێبانە ڕاست‌کەنەوەو نەهێڵن چیی‌تر بە قوتابیان بخوێنرێن .

(٥) ئەم ڕاستیە لە تەماشاکردنـــی دەستنووســـە کوردیـــە کۆنەکـان‌و پێشترین‌لەچاپدراوە کوردیەکان‌و بەراوردکردنی ساڵانی نووســـینەوەو لەچاپدانیانەوە بەئاشکرا بۆ سەرنجدەر دەرئەکەوێ .

بــۆ زانینی زۆرترو بەدرێــژی لەبــارەی گەشــەکردنـی داهێنانـــی شێوەنووسینی کوردیەوە ، بڕوانەرە : دوکتۆر ئەوڕەحمانـی حاجـــی مارف ، نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، لە چاپکراوەکانـــی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستان ، بەغـدا ١٩٨٥ ، چاپخانەی (علاء) .

بەم جۆرە هەر لە سەرەتای بلاوبوونەوەی کەمکەمی نووسینی کوردییەوە ، وردەوردە دەسکاریکردنی شێوەنووسینی عەرەبیو فارسییش بە پیتی عەرەبی دەستیپێکردوەو ، ئەم کارە ڕاستو دروستە لە ماوەی پاش جەنگی یەکەمی جیهانەوە لە کوردستانی عێراقو بەتایبەتی لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتیدا گەشەیەکی زۆری کردوەو ئەتوانم بە دلنیاییەوە ـ بلێم ئێستا گەیشتووینەتە ئاستێك پاش چارکردنی هەندێ گیروگرفتی کەم کە هێشتا ماوە ، پێمان ئەکرێ بلێین ئەتوانین بۆ هەمیشە زمانی کوردی بەم پیتە عەرەبییە دەسکاری کراوانە بنووسینو ، ئەو بانگو داوایەی سی ـ چل سالێ لەمەوبەر بەهۆی دەستەوەستانیی ڕۆشنبیرانی کوردەوە لە بەرانبەر چارەکردنی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردییا بە پیتی دەسکاریکراوی عەرەبی هەبوو و چارەیان بۆ نەئەدۆزرایەوەو لەژێر کاریگەریی پڕۆپاگاندەی هەندێ لایەنا بۆ بەکارهێنانی پیتی لاتینی بۆ نووسینی کوردی ، ئەو داوایەیان بەدلا چووبوو ، ئێستا خەلکەکە تێکرا ڕیالیستانەتر بیرئەکەنەوەو مەیلێکی ئەوتۆ بۆ بەکارهێنانی لاتینی بۆ نووسینی کوردی لەناوا نەماوە .

بەلێ ڕاستە هێشتا میللەتی کورد چ لە کوردستانی عێراقو چ لە کوردستانی ئێران کە لەوێیش بەهۆی گیانی کوردایەتییەوە کە دەولەت نەیتوانیوە سەرکوتی بکاو ئەوەتە ئێستا هەندێ گۆڤاری نیوەکوردیو نیوەفارسیو هەندێ کتێبی کوردیو کتێب دەربارەی کورد بە فارسی دەرئەچنو ، بەشی کوردی لە چەند زانکۆیەك کراوەتەوەو ، چەندین ئێستگەی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی کوردی دانراوەو ، بەهۆی کاریگەریی ڕۆشنبیریی کوردیی کوردستانی عێراقەوە ، کوردینووسین تا ڕادەیەکی باش بلاوبوەتەوەو ئەدیبو بنووسانی کوردی ئێران ئەتواتن وتارو شیعری بێگرێوگۆڵ بە زمانی کوردی بنووسنو چ لای خۆیانو چ لە گۆڤارەکانی کوردستانی عێراقا بلاوی بکەنەوە ،

ئەڵێم بەڵێ ڕاستە هێشتا میللەتی کورد کە لە هەموو ئەو شوێنانەیا بە پیتی عەرەبیی دەسکاری کراو ئەنووسێ ، گەلێ گیروگرفت لە ڕێی جێگیربوونی شێوەنووسینی یەکگرتوویا هەیەو وەختە بڵێم زۆر کەس زۆر وشە هەر یەکە بە جۆرێکی جیاواز لە یەکتر ئەنووسن ، بەڵام ئەمە خەتای ئەوە نیە کە شێوەنووسینێکی تا سنووری ۹۰٪ یەکگرتوومان نیە • شێوەنووسینی وامان هەیە ، بەڵام لایەنێك نیە چاودێریی بکاو کارێك بکا لەناو جەماوەری بنووسانا بیچەسپێنێ • بۆ نموونە ئەگەر هەموو کتێبەکانی قوتابخانەکان بەو شێوەنووسینە گشتیە بنووسرانایەتەوەو ، ئەگەر هەموو ساڵێ خولی فێرکردن بۆ مامۆستاکانی قوتابخانەکانی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەکار بکرابایەتەوەو فێری ئەو شێوەنووسینە بکرانایە تا ئەوانیش ناچار بوونایە بەتەواوی فێری ببن‌و خۆیان بە پابەندی بزانن‌و قوتابیەکانیان بە نووسینی‌وا ڕابێنن‌و بەو جۆرە منداڵان فێر بکەن ، ئێستا بنەمایەکی پتەومان بۆ ئەوە ئەبوو لە ماوەی ۱۰ ــ ۱۵ ساڵا وەچەی لە سەرەتای ئەم بەرنامەوە چووە قوتابخانەمان فێری شێوەنووسینێکی یەکگرتوو ببێ‌و ئەم شێوە نووسینە یەکگرتوە بەناو هەموانا بڵاوببێتەوەو پاش چەند ساڵێك بەهۆی بەسەرچوون‌و بڕانەوەی وەچە بەساڵاچووەکانەوە کە هەر بەشێکیان بەجۆرێ ئەنووسن ، ئەو جۆرجۆری‌و پارچەپارچەییە لەناوا نەئەماو گیروگرفتەکان چارەسەر ئەکران •

بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتە کەمانەی هێشتا لە ڕێی دروستبوونی شێوەنووسینێکی یەکگرتووی کوردیدا ماون ، هەوڵی جۆربەجۆرو پێشنیای زۆر پێشکێش کراوەو بۆچوونی زۆریش لەلایەن ئەم‌وئەوەوە خراوەتەکارو

خەڵك پەسەندیان کردوون و لەسەریان ڕۆیشتوون و ، هەندێ کەسیش پێشنیاو بۆچوونەکانی خۆیانیان لە شێوەی کتێبا بڵاوکردوەتەوە [٦] .

لێرەدا مەیدانی ئەوە نیەو بەڵکو تەنانەت توانی ئەوەیش نیە ئیشارەت بۆ هەموو هەوڵێکی تاکەکەسی بکەین ، چونکە ئەگەر درێژەکێشانی مەسەلەکەیش بخەینە لاوە ، کەس توانی ئەوەی نیە ئەوەمان بۆ دەسنیشان بکا خاوەنی هەر بیرو بۆچوون و پێشنیایەکی خراوەکار کێیەو ، ئەگەر هەندێکیشی بزانرێ ئیسپاتکردنی ئاسان نیە . بۆیە هەر ئەوەندەمان بۆ ئەمێنێتەوە لەپێناوی بەڵگەدارکردنی دانەپاڵی هەر بیرو بۆچوون و پێشنیایەك لەم مەیدانەدا ، دەستەودامێنی خاوەنە هێشتا لە ژیانا ماوەکانیان ببین باسی ئەو کارانەمان بۆ بنووسنەوە کە لەم بارەوە کردوویانە چونکە ئەوە هەنگاوێکی پربایەخە لە بواری نووسینی مێژووی گەشەکردنی بەکوردی نووسینا .

بۆیە تەنها ئیشارەت بۆ هەوڵ و تەقەلا دەستەجەمعییەکان ئەکەین و ئەڵێین : لە ساڵانی سەرەتای بوونی کۆڕی زانیاری کوردا کۆڕ هەندێ

---

(٦) لەو کارانەی لەم مەیدانەدا لە عێراقا کراون و لە بەردەستی منا هەن ، ناوی ئەم کتێبانە ئەهێنم :

ا ــ نوری عەلی ئەمین ، ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، ١٠٤ لاپەڕە ، بەغدا ١٩٦٦ ، چاپخانەی (سلمان الاعظمي) .

ب ــ ا . ب . هەوری ، دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی ، ٤٢ لاپەڕە ، سلێمانی ١٩٦٨ ، چاپخانەی کامەران .

ح ــ طاهر صادق ، رینوس ، چۆنیەتی نوسینی کوردی ، ١٤٤ لاپەڕە ، کەرکوك ١٩٦٩ ، چاپخانەی شیمال .

د ــ د. نەسرین محەمەد فەخری ، ڕێنووسی کوردی ، ٩٢ لاپەڕە ، سلێمانی ، ١٩٧٧ ــ ١٩٧٨ ، چاپخانەی صەلاحەددین .

بڕیاڕی داو بڕیارەکانی خۆی لە گۆڤارەکەیا بلاوکـردەوەو[٧] تەنانـەت بەش‌بەحالی چاپخانەکەی ڕایسپارد پیتە بڕیاردراوەکانی خـۆی وەك (ڕ)ی حەوت‌لەسەرو (ۆ)و (ێ)ی کەشیدەلەسەری بۆ بە دروست‌کردن داو[٨] ، کە ئەو پیتانەی بۆ هاتن هەر لەچاپدراوێکی بەگوێرەی بڕیارەکانـی خـۆی ئەچاپ‌ئەداو ، لەسەر هەر خاوەن وتارێ لە گۆڤارەکەیاو هەر خاوەن کتێبـێ کە کتێبێکی بۆ بلاوبکردایەتەوەی ـــ پێویست ئەکرد بابەتەکەی بەگوێـرەی ئەو شێوەنووسینە بنووسێتەوە کە بۆخۆی بڕیاری‌داوە • ڕاستەکەیشـی ، بەشێ لە بڕیارەکانی چونکە بەجێو ورد بوون جێی خۆیانیان گرت وەك ئەوە کە (تر)ی نیشانەی سیفەتی زیـاد وەك (چاکتر) بنووسـێنرێ بـە وشـەی پێشیەوە ، ئەو (تر)ەیش کە بۆ نیشانەی جیاییە وەك (پیاوێکی‌تر) بەجیـا

---

(٧) بڕوانەرە : گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، بەرگـی یەکەم ، بەشی یەکەم ١٩٧٣ ، ل ٣٦٤ ـــ ٣٧٩ ، بەغدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد .

(٨) لە دەسگاکانی ئەنتەرتایپو لاینۆتایپی جارانی دێرداڕشتنا کە لە عێراق بەکارئەهێنران ـــ و ئێستایش تاڕادەیەك هەر بەکارئەهێنرێن ـــ هەرچەند توانی ئەوە هەبوو بابەتی کوردییش ـــ وەك عەرەبی ـــ داڕێژرێ ، ئەوەندە هەبوو پیتە کوردییەکانو پیتە ئیشـارەت‌لەسەرو لەبنەوە دانراوەکـان لە قاسەی پیتەکانا نەبوونو ڕاستەوخۆ دەستیان نەئەگەیشتێ ، بەلکو ئەبوو لە خانەیەکی تایبەتییەوە بهێنرێنو بخرێنە شوێنی پیتە عەرەبییەکان لەوانەی لە کوردیدا بەکارناهێنرێن یا کەم بەکارئەهێنـرێن وەك (ث)و (ذ)و (ص)و (ض)و (ط)و (ظ) • بۆ یەکەم‌جار لە مێژووی چاپی کوردیـدا لە عێراق ، کۆڕی زانیاری کورد کە ڕایسپارد دەسگایەکی ئەنتەرتایپـی لـە ئەلمانیـاوە بـۆ بهێنـن ، نەخشـەیەکی پیتەکانیشـی بۆ نارد . لەونەخشەیەدا ئەو پیتە عەرەبییانەی لە کوردییا هەرگیز یا جاروبار نەبێ، بەکارناهێنرین ، خرابوونە لاوەو پیتە کوردیو پیتە ئیشارەت‌لەسـەروو یا لەبنەکانیان لە جێ دانرابوون . ئەو نەخشەیە بەندە ئامـادەم‌کـردو کۆڕ ناردی بۆ بەدروستکردن ـــ دانـی لـە ئەلمانیـاو ، ئێستایش لـە چاپخانەی کۆڕی زانیاری ـــ دوای هەلوەشاندەوی کۆڕی زانیـاری کورد لە ١٩٧٩دا ـــ هەر بەکارئەهێنرێ . .

...

له وشەی پێشوو بەڵام لەپاڵیا بنووسرێ • هەندێکیشیانی بۆ نەچوونەسەر وەك دانانی (ٚ) لەسەر (ڒ) کە ساڵەها بوو خەڵك پاش دەس‌هەڵگرتن لە نووسینی دوو (ر) لەجیاتیی (ڕ)ی گیراو (ٚ)ەکەیان لەژێر (ڕ)ەکەدا دائەنا • نەبوونی پیتو ئیشارەتە پێشنیاکراوەکانی کۆڕیش لەو مەکینانەی دێرداڕشتنا کە لە عێراقا بەکارئەهێنران، دەورێکی زۆری لە سەرنەکەوتنی ئەو پێشنیایانەی کۆڕا هەبوو کە خەڵك خوویان پێوە نەگرتبوونو لەسەر دڵیان گران بوو واز لەو شێوەنووسینە بهێنن کە فێری بووبون • بۆیە بەکارهێنانی تێکڕای بڕیارەکانی کۆڕی زانیاری کورد، لە مەودایەکی کەما نەبێو لە سنووری کۆڕ خۆیو سەردەمی مانەوەیا، ڕێگای جێبەجێکردنیان لە ڕووا نەکرایەوەو، بە هەڵوەشاندنەوەی کۆڕ لە ۱۹۷۹داو دانانی دەستەی کوردی سەر بە کۆڕی زانیاری عێراق لەجێی، لە چاپخانەکەیشیا کە بوو بە بەشێ لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، پشت‌گوێ خراو لەبیرچوەوە[٩]•

---

(٩) لەگەڵ ئەوەیش، وەك وتمان، کۆڕ بەرەسمی زۆر سوور بوو لەسەر ئەوە کە ئەو شێوەنووسینەی بۆ هەندێ پیتو وشەی دانابوو بەتەواوی جێبەجێ بکرێ، لەبەرئەوەی لە لایەکەوە هەموو ئەوانەی کاری بەچاپ‌گەیاندنی وتارو کتێبیان لای کۆڕ ئەبوو شێوە نووسینەکە بەووردی فێر نەبووبوونو لە لایەکی‌کەیشەوە لە کۆڕ خۆیا بەرپرسێکی لێزان بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو جێبەجێکردنە دانەنرابوو، ڕێنووسەکە لە هەندێ حاڵەتی کەمی وەك نووسینەکانی مامۆستا مەسعوود موحەممەدو دوکتۆر کەمال مەزهەرو دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی‌مارفو بەندەدا نەبێ بەباشی جێبەجێ نەئەکرا. تەنانەت جارێکیان کۆڕ کتێبێکی بۆ مستەفا نەریمان لەچاپ‌دابوو، چونکە ناوبراو شارەزایەکی تەواوی لە شێوە نووسینەکەی کۆڕا نەبووبوو هەڵەی زۆری لە نووسینەوەی دەسنووسەکەیا کردبوو. دوکتۆر جەمال نەبەز کتێبەکەی نەریمانی بەدەست کەوتبوو. چونکە هەڵەی سەیرو سەمەرەی لە نووسینەوەیا ـ بەپێی شێوەنووسینەکەی کۆڕ ـ کردبوو، د. نەبەز وای‌زانیبوو شێوەنووسینی کۆڕ بەوجۆرەیە، وتارێکی لە ڕەخنەلێ‌گرتنی ئەو شێوەنووسینەدا نووسیبوو کۆمەڵێ ڕەخنەی لە کۆڕ تیا گرتبوو کە ئەبوو لەڕاستیدا لە نەریمان بگیرانایە کە بەهەڵە شێوەنووسینەکەی کۆڕی لە دەسنووسی کتێبەکەیا جێبەجێ کردبوو.

له ١٩٨٥یشا دەستەی کوردی سەر بە کۆڕی زانیاری عێراق کۆبوونەوەیەکی بەناوی (کۆڕی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی) یەوە ڕێکخستو کۆمەڵێ بنووس‌و ڕۆشنبیری له بەغداو کوردستانی عێراقەوە بۆ بانگ‌کرد . لەئەنجامی گفتوگۆو لێکۆڵینەوەیەکی دوو ڕۆژ خایەندا کۆبوونەوەکە کۆمەڵێ بڕیاری لەبارەی گیروگرفتە چارەسەرکراوو نەکراوەکانی نووسینی کوردییەوە دەرکردو پاشان بڕیارەکان لە ژمارە ١٥ی١٩٨٦ی گۆڤاری دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری‌و[10] له دوو نامیلکەی بچووك‌و گەورەتری سەربەخۆدا بلاوکرانەوە[11] . دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردیش کە بەرپرسی دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانی دەولەتە له بەغداو هەروەها ساڵانە کۆمەڵێ کتێبیش بە کوردی بلاوئەکاتەوە ، ماوەیەك ویستی بڕیارەکانی ئەو کۆڕە له بلاوکراوەکانی خۆیا جێبەجێ بکاو بۆ ئەم مەبەستە کاربەدەستێکی تایبەتیی دانا تەماشای هەر بابەتێ بکا کە له هەرکام له گۆڤارو ڕۆژنامەکانیا بلاوئەکرێنەوە تا ئەگەر بەگوێرەی بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە نەنووسرابوون ، بەپێی ئەو بڕیارانە دەسکارییان بکا . بەلام دیارە ئەرکێکی‌وا گەلێ لەوە زیاترە

---

(١٠) بڕوانەرە : عبداللطیف عبدالمجید گلی ، لەبارەی کۆبوونەوەو ڕاسپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی‌یەوە ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق «دەستەی کورد» ، بەرگی پازدەهەم ، ١٩٨٦ ، لاپەڕە ٢٨١ ــ ٣٠١ .

(١١) توصیات ندوة الاملاء الکردي الموحد التي اقامها المجمع العلمي العراقي « هیئة اللغة الکردیة » ببغداد في ١٨ ــ ١٩٨٥/١٢/١٩ ، ڕاسپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەك‌گرتووی کوردی کە کۆڕی زانیاری عێراق «دەستەی کورد» لە بەغدا لە ١٨ــ١٩٨٥/١٢/١٩دا گێراویە ، ٦ لاپەڕە ، مطبعة المجمع العلمي العراقي ؛ ڕێنووسی کوردی بەپێی بڕیارەکانی کۆڕی زانیاری عیراق ــ دەستەی کورد ١٤٠٧ ك ــ ١٩٨٧ ز ، ٧١ لاپەڕە ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق .

کاربەدەستێك کە خوا ئەزانێ خۆی تا چڕادەیەك ئاگاداری ئەو بڕیارانەیەو چۆن لە زەینیا جێگیر بوون بتوانێ هەموویان لە نووسینەکانی بەردەستیا بەسەربکاتەوەو ئەو نووسینانە بەوپێیە ڕاستبکاتەوە • بۆیە ، کارەکە هەر لە سەرەتاوە بە کاڵوکرچی هاتو پاش ماوەیەکی کەمیش یەکجاری پشتگوێ خرا • هەرچی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری خۆیشیەتی ، هیچ هەنگاوێکی بەرەو جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە لە لەچاپدراوەکانی خۆیا هەڵنەهێنایەوە •

لە ١٩٩٨یشا کۆڕێکیتر لە هەولێر لەژێر دروشمی (پەرەپێدانی زمانی کوردی ئەرکێکی نەتەوەییە)دا گیراو خەڵکێکی زۆری بۆ بانگکرا • ئەوکۆڕەیش کۆمەڵێ بڕیارو ڕاسپێریی لە بواری چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردیی نوێدا دەرکرد کە زۆریان لەگەڵ بڕیارو ڕاسپێرییەکانی کۆبوونەوەکەی ١٩٨٥ی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق لە بەغداو بڕیارەکانی زووتری کۆڕی زانیاری کورد هاوجووت بوون• ئەم کۆڕەیش ، وەك کۆڕەکەی ١٩٨٥ی بەغدا، لە مەیدانی خاڵبەندیو زاراوە دروست کردنیشا بڕیارو ڕاسپێریی خۆی هەبوو کە لەم دانیشتنەی ئێمەدا جێی باسلێکردنی نییە[١٢] •

هەرچی ئەم دانیشتنەی ئێستامانە ، من ئەمەوێ بەسەر بڕیارەکانی کۆبوونەوەکەی ساڵی ١٩٨٥ی بەغدادا بچمەوە تیاو ، ڕاو بۆچوونی ئێستای خۆم لەبارەی بەشی شێوەنووسینی کوردییەوەی تیا دەرببڕمو ڕوونیبکەمەوە کامەیانم لا پەسەندەو کامەیان ئەبێ چاوی پیا بگێڕێتەوەو ، بۆچی ؟

---

(١٢) لەبارەی ئەم کۆڕەو بڕیارەکانیەوە ، بڕوانەرە : گۆڤاری (نووسەری نوێ) گۆڤارێکی ئەدەبیی مانگانەیە یەکێتی نووسەرانی کورد ، لقی هەولێر ، دەریدەکات ، ژمارە ٧ ، بەفرانبار ٢٦٩٨ ك ، کانوونی یەکەمی ١٩٩٨ ز (ژمارەی تایبەت لەمەڕ سمیناری پەرەپێدانی زمانی کوردی) .

لەپێشا لەو بڕیارانـەی کۆبوونەوەکە ئەدوێـم کـە لامپەسەنـدن‌و لەڕاستیيشا زۆری ئەو بڕیارانە جەخت‌کردنەوەن لەسەر پەسەندیی بۆچوونی پێشتری بنووسانی کورد کە هەرچـۆن بووبێ دایانـاون‌و خەڵکی‌تریـش پەسەندیان کـردوون‌و لەســەریان ڕۆیشـتوون‌و ، بەداخـەوە نـازانرێ پێشنیاکەری یەکەمی هەرکامیان کێیـەو ، تەنانەت دۆزینـەوەی مێـژووی بەکارهێنانی یەکەمجاری هەرکامیشیان ئەرکێکی گەورەیەو کێومالێکـــی پشوودرێژ بەناو دەسـنووس‌و لەچـاپدراوە کـوردییەکانـا بـۆ ئــەم دۆزینەوەیە پێویستە •

١ ــ دانانی نیشانەیەکی وەك ژمارە (٧)ێکی بچکۆلانە لـەژێر (ڕ)ی قەڵەوی وەك لە وشەی (ڕۆژ)ا ، کە من وامپێ‌باشە پێی‌بوترێ (ڕ)ی «ڕەق» چونکە (ر)ی قەڵەو (ر)یەکی‌ترە وەك (ر)ی (وارحمنا)ی عەرەبی‌و ، مـــن پێ‌بزانم ئەم جۆرە (ر)یە لە هەندێ دیالێکتا نەبێ لە کوردییا نیە • هەروەها دانانی ئەم نیشانەیە لەسەر (ڵ)ی قەڵەوی وەك ئەوەی وشەی (گـوڵ)و ، لەسەر (ۆ)ی کلۆری وەك لە وشەی (بۆ)و ، (ێ)ی کلۆری وەك لە وشـەی (دێ)دا • دانانی ئەم نیشانەیە لە هەموو ئەم شوێنانەدا دەمێ بوو داهاتبوو ، بەڵام کۆڕی زانیاری کورد کاتی خۆی هاتبوو بڕیاڕی دابوو نیشـانەکەی ژێـر (ڕ) بگـوێزێتەوە بۆ سـەری‌و ، بەمە گـیروگرفتێکـی زۆری بـۆ تیپ‌ڕێکخەران‌و تێپ‌دارێژانی چاپخانەکان‌و بۆ پرۆڤە ڕاستکەرەوەکـــان دروستکرد چونکە زۆر جار کرێکاری کوردی نەزانی چاپخانە ئەم پیتـی (ڒ)ی (٧)لەسەرەی دەسنووسی لێ ئەگۆڕا بە (ژ)و ، زۆرجاریش ئەم هەڵەیە لە ڕاستکردنەوەدا بەسەر ڕاستکەرەوەدا تێئەپەڕی‌و سەرەنجام پیتەکە بـــە (ژ) چاپ‌ئەبوو •

ئەم نیشانانەی (٧)ی ژێر (ڕ)و سەر (ڵ)ی قەڵەوو (ۆ)و (ێ)ی کلۆرە نیشانەگەلێکی پێویستن ، چونکە (ڕ)ی ڕەقی وەك هیی (ڕۆژ)و (ر)ی نەرمی وەك هیی وشەی (بەرد)و ، (ڵ)ی قەڵەوی وەك هیی (گوڵ)و (ل)ی نەرمـــی وەك هیی وشەی (گەل)و ، (ۆ)ی کلۆری وەك هیی (بۆن)و (و)ی کورتـــی وەك هیی (کورد)و (و)ی درێژی وەك هیی (چوون)و ، (ێ)ی کلۆری وەك هیی (تێر)و (ی)ی کورتی وەك (ی)ی ئیزافـــەی وەك هیـــی (کوڕی من)و (ی)ی پێکەوەبەســـتنی ســـیفەتو مەوســـــووفی وەك هیـــی (مـــــرۆی ئازا)و (ی)ی درێژی وەك هیی (پیاوەتی) جیان لە یەك • بۆیەیش ئەگـــــەر پیتی (ڕ)ی ڕەق کەوتە سەرەتای وشەیش کە هەرگیز (ر)ی نەرمی ناکەوێتێ، ئەبێ (٧)ەکەی هەر لەژێرا دابنرێو ناوترێ مادەم (ر)ی نەرم ناکەوێتـــە سەرەتای وشەوەو ئەو (ر)یەی ئەکەوێتە ئەو شوێنەوە هەمیشە (ڕ)ی ڕەقـــە ترسی هیچ بەهەڵە خوێندنەوەیەکیمان نیە ، چونکە هەرکام لـــەم دوو جۆرە (ر)یە هەریەکی پیتێکی جیاوازو سەربەخۆیە لەویانو ، لەبەرئەوەی لــــــە عەرەبییا ــ کە لەوێوە هاتوونەتە نووسینی کوردییەوە ــ بە هەردوکیان یەك شێوەیان هەیە ، تا ئێمە بەم نیشانەی (٧)ەی خستوومانەتە ژێر ڕەقەکەیان ، لە کوردییشا هەر یەك شێوەیان بوە ، وەك چۆن (ج)و (ح)و (خ) لـــــــە عەرەبییشو لە کوردییشا سێ پیتی جیانو تەنها شکڵیان وەك یەکەو بـــە نوختەو شوێنی نوختەکەدا لێك جوێ کراونەتەوە •

٢ ــ نووسینی (و)ی درێژ بە دوو (و = وو) • ئەمەیش لەمێژە هەیەو کۆبوونەوەکە هەر ئەوەندەی کردووە بە باشی زانیوەو ، باشیشی بۆچووە ، جەخت لەسەر نەگونجانی بۆچوونەکەی کۆڕی زانیاری کورد بکا کە کاتی خۆی بڕیاری‌دابوو بە یەك (ۊ)ی کەشیدە لەسەر بنووسرێو بەو کەشیدەدا لە جۆرەکانی‌تری (و) جوێ‌بکرێتەوە • لەڕاستیدا ئەم (و)ی درێژە نـــــە دەنگی (و)ی دەنگدارەو نە دەنگی (و)ی بێ‌دەنگو ، دەنگێکی تایبەتییـــە مادەم لەمەوپێش پیتی تایبەتیی بـــۆ دانەنـــراوە چونکە لە عەرەبییـــا هـــەر

بەوجۆرە بوە ، دانانی (دوو و = وو) بۆی لە کوردییا کارێکی بەجێیەو ، ئەم دوانییە لەگەڵ درێژییەکەی ئەگونجێو ، ئەبێ بە شێوەیەکی جوێ لە شێوەی دەنگی (و)ی کورتو (و)ی کلۆور بنووسرێ • سەرەڕای ئەوەیش کە ، وەك وتمان ، لەمێژە بەم جۆرە لەناو بنووسانا چەسپاوە •

٣ ــ نووسینی دیفتۆنگی (و)و (ی)ی پێکەوەی درێژ هەر بە (و)و (ی)یەك وەك لە (قویل)و (دویر)ی هەندێ دیالێکتدا ، چونکە خەڵکەکە بێ هیچ گیروگرفتێك لەسەر ئەمە ڕۆیشتوون •

٤ ــ جۆی نەکردنەوەی شێوەنووسینی (و)ی دەنگدارو (و)ی بێدەنگ ، چونکە هەر لە سەرەتای بە کوردی نووسینەوە خەڵك وایان نووسیوەو هیچ کەندوکۆسپێکیش نەهاتوەتە ڕێی کەس •

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم ئەوەیش ڕوونکەمەوە کەوا من ئیستیلاحی (دەنگدار)و (بێدەنگ)م بە ڕیز لەجیاتیی (نەبزوین)و (بزوێن) لا ڕاستە ، هەروەك ئیستیلاحی (صائت)و (صامت)ی عەرەبی ، چونکە (نەبزوێن) واتە (غیر محرّك)و (بزوێن) واتە (محرّك) ، لەکاتێکا کە مەبەست لە (نەبزوێن) پیتی ئەسڵیو لە (بزوێن) پیتی نیشانەی سەرو ژێرو بۆری پیتی پێشەوەیەتیو ، ئەم دوو واتا زۆر لەیەکەوە دوورن ، بەلام (دەنگدار)و (بێدەنگ) پڕبەپێستی مەبەستی دروست لە (نەبزوێن)و (بزوێن)ی بەهەڵەو لە نەزانینی واتاوە بەکارهێنراون •

٥ ــ (د)ی کلۆور وەك (د)ی (قادر) لە دیالێکتی سلێمانیدا ، کە من وا بە ڕاست ئەزانم پێی‌بوترێ (د)ی منگن ، هەر بە شێوەی (د) بنووسرێ ، واتە نەك وا کە خوالێخۆش‌بوو مامۆستا تۆفیق وەهبی پێشنیای کردبوو نوختەیەك لەژێر (د)ەکەوە دانرێو بۆ خۆیشی لەهەندێ نووسینیا وای ئەکردە

٦ ــ دانەنانی هیچ نیشانەیەکی (ی)و (و) بۆ ژێری فرەکورت وەك لــە (بزن)و (پیاز)و (سیان)و ، بۆ بۆری فرەکورت وەك لە (شوان)و (گوان)و (وشە)دا لەپاش پیتی یەکەمی وشەوە ، چونکە ئەگەر ئەو (ی)و (و)ە نیشانانە بنووسرێن لەوانەیە زۆر کەس لە حاڵەتی نووسینی (ی)کەدا ژێرێك بــدەن بە پیتەکەی پێشەوەیو بخوێننەوە (بیزن) یا (پییاز) یا (سییان) و ، لــە حاڵەتی نووسینی (و) کەدا بۆرێك بدەن بە پیتەکەی پێشــەوەیو بخوێننەوە (شووان) یا (گووان) یا (ووشە)و ئەوەیش ئەبێ بەهۆی گۆڕینی وشەکان •

منیش ئەڵێم مەسەلەکە پێویستی بەم ئاڵۆزکاندنو گرێکوێرە تێخستنە نیەو ، ئەوەی ناویان لێناوە (ژێری فرەکورت) یا (بۆری فرەکورت)و عەرەب پێی‌ئەڵێن (کسرة مختلسة) یا (ضمة مختلسة) ، هەر ئەوەیە پێشینانی خۆمــان پێیانوتوە (زەنە)و عەرەب پێیانوتوە (سکون)و ، هیچ پیتێکی نزیکــی خۆیمان وەك (ی) بۆ ژێرو (و)بۆ بۆر بە نیشانە بۆ دانەناوەو نەنووسیوەو ، کەسیش نەبوە نەزانێ چۆنی بخوێنێتەوەو ، بڕایەوە •

٧ ــ نووسینی دیفتۆنگــی (وێ) وەك لە (نوێژ)و (شوێن)و (جوێن)دا هەر بە (و)ێكو بە (ی)یەکی کلۆر • ئەوەی هەندێ کەس بــۆی چــوون گوایە ئەم دیفتۆنگی (وێ)یە دەنگێکی تایبەتیەو (و) و(ی) نیــەو ئەبــێ نیشانەی تایبەتیی خۆی هەبێو ، لەبەرئەوە بە (ۆ)ێکی کەشیدە لەســەری ئەنووســنو ، تەنانەت بیســت ســاڵ پتــر پێــش دامەزراندنــی کۆڕی زانیاری کورد پیتــی (ۆ)ی کەشــیدەبەسەریان بــۆ بە داڕشــتن دا[١٣] ،

---

(١٣) هەڵگری ئاڵای نووسینی ئەم دیفتۆنگە بە شێوەی (ۆ) مامۆستا تۆفیــق وەهبی بوو و هەر بە تەقەلای ئەویش یەك دوانێ لە چاپخانەکانی بەغــدا ناردیان پیتێکی بەمچەشنەیان بۆ لاینۆتایپەکانیان داڕشت . بـــەڵام خواستەکەی بۆ نەچوەسەرو لە دوکتۆر مارف خەزنەدار بەولاوە کەس لاسایی نەکردەوە . بەڵکو هەندێ کەسیش کە ئەیاندی بەم پێیــە ئەبێ بۆ ڕستەیەکی وەك (گوێم لــێ گــرت) بنووسرێ (گــۆم لــێ گــرت) ، مەسەلەکەیان کردبوو بە نوکتەو گاڵتەجاڕیو پێی پێئەکەنین !

ئەوە ئەگەر بۆچوونەکەیشیان ڕاست بێ، مادەم ئەم دیفتۆنگە هەر لە سەرەتاوە شێوەیەکی تایبەتیی نەبووەو هەر بە (و)یێـك‌و (ێ)یـەك نووسراوەو هیـچ تەگەرەیەك بەو هۆیەوە تا ئێستا نەهاتوەتە ڕێی کەس ؛ گۆڕینەکەی لــــە سەرلێشێواندنی خەڵك بەولاوە هیچ ئەنجامێك نابەخشێ‌و هەر وەك خـۆی بمێنێتەوە چاکترە •

٨ ــ نووسینی (ت)ی ضەمـیری گفتوگـۆ لەگەڵ‌کراو ، هەرچەنـد نەیشخوێنرێتەوە ، وەك (ت) لە (ئەتبینم)و (ناتبینم)دا کە لە دیالێکتی سلێمانیدا بە شێوەی دەنگێکی وەك دەنگی (د)ی (قادر) گۆئەکرێ • ئەم جـــۆرە (ت)یەیش کە لە کۆبوونەوەکەدا ناوی (ت)ی کلۆری بۆ دانراوە ، مـن وام پێ باشە ناوی (ت)ی منگنی لێ بنێین وەك (د)ەکەی دیالێکتی سلێمانی کـە ئەم ناوەمان بۆ ئەویش پێشنیاکرد •

٩ ــ نووسینی پیتی گیراو (مشدَّد) کە لە کۆبوونەوەکەدا نــــاوی (پیتی دووباد)ی لێ‌نراوە ، بە دوو پیت وەك لە (کەللە)و (زللە)دا • ئـەم پیتە گیراوە لەڕاستیدا وەك دوو پیتە ، ترنجێنراویشنەتەیەك • بۆیە من ناوی (گیراو)م بۆ داناوە چونکە وشەی (گیراو) زیاد لە واتای دووبادییەکـەی ، تێکترنجاندنی دوو پیتەکەیش ئەگەیەنێ • سەرەڕای ئەوە کە لە کۆنیشـاو لە وتنەوەی ئەلفوبێدا بە منالآن ، پێیان وتووە (گـیراو) ، لەکاتێکـا کـە دووبادی واتای تێکترنجاندنەکـەی تیا نیەو جەخـتکردن لەسەر ئـــەم تێکترنجاندنەیش مەبەستە •

١٠ ــ لێك جوێ‌کردنەوەی (ە)ی نیشانەی سەر (فەتحە) واتـە (ە)ی بێ‌دەنگ‌و (ە)ی دەنگدارو نووسینی یەکەمیان بە شێوەی (ە)ی خڕ یـــا (ە)ی نووساوی دوای وشەو نووسینی دووهەمیـــان بە شـێوەی (ھ)ی دووچاوی سەرەتا یا (ھ)ی نێوان دوو پیت •

١١ ــ نووسینی وشەی (چ) بۆ پرسیار بێ یا بۆ گەیاندنی واتـــای چونیەکی بە سەربەخۆیی ، سەربەخۆ لە وشەی پاشـــەوەی ، وەك (تــۆ چ کارەی ؟) یا (چ خوای گورگ و چ خوای سوار) • منیش ئەڵێم : بــەڵام ئەبێ لەپاڵ وشەی دواوەیا بنووسرێ ، چونکە لە وتنا پێکەوە ئەوترێن وەك لە (و)ی عەتفدا •

١٢ ــ ئەو وشانەی لە یەك پیت پێکدێن و بۆ پێوەنـدین ، وەك (ل)و (د)و (ب)و (ژ) لە دیالێکتی کرمانجیــی ســەروودا ، بەجوێ لــە وشــەی پاشەوەیان بنووسرێن • بەڵام بۆ خۆ دوورگرتن لە جوێبوونەوەی تەواویان لە یەك ، من بە پێویستی ئەزانم لەپاڵ یەکا بنووسرێن و بەتایبەتی هەرگیـــز نەهێڵرێ بکەونە دوو دێرەوە •

١٣ ــ وشەی (ئەم)و (ئەو) ئەگەر دواییەکەی سیفەت بوو یا بــۆ ئیسناد بوو ئەلکێنرێن بە یەکەوە وەك (ئەمڕۆ)و (ئەمساڵ) • واتە لە غەیری ئەم حاڵەتانەدا بەجیا ئەنووسرێن • من لاموایە ئەم بنەمایە بنەمایەکی تــەواو نیە ، چونکە بەم پێیە ئەبێ لە ڕســتەی (ئەم پیــاوە پیاوێکــی زیرەکــە)دا (ئەم)ەکەو (پیاوە)کە بلکێنین بە یەکەوە ، کەچی تائێستا کەس وای نەنووسیوە• بۆیە ئەبێ بڵێین (ئەم) ، وەك وشەیەکی سەربەخۆ ، هەمیشــە بە جیــا لــە پاشەوەی ئەنووسرێ و ، تەنانەت ئەتوانین (ئەمڕۆ)و (ئەمساڵ)یش بە جیا لــە یەك بنووسین ، واتە بنووسین (ئەم ڕۆ)و (ئەم ساڵ) ، بەڵام وا ڕۆیشتوون کە بە یەکەوە بنووسرێن و ، وا ڕۆیشتنیش بنەمایەکی سەرەکییە بــۆ ڕەواداشتنی ڕۆیشتووەکە ، یا بە کەمیاب (شاذ)یـان داتێین و هەمــوو قاعیدەیەکیـــش شازی هەیە •

١٤ ــ وشەی عەرەبی کە هاتە زمانی کوردییەوە ، لە هەموو ڕوویەکەوە وەك کوردی ئەنووسرێ و مامەڵەی وشەیەکی تەواو کوردیی لەگەڵ ئەکرێ •

نەجیاتیی سەر (ە)و ، لەجیاتیی بۆر (و)و لەجیاتیی ژێر (ی)ی تێدا دائەنرێ‌و پیتی شەددەدارو گیراوی تیا ئەکرێ بە دووبادو تا دوایی •

١٥ ـ (ی)ی ئیزافە یا پێکەوەبەستنی ناوو سیفەت لەگەڵ وشەی پێشووی پێکەوە ئەنووسرێن [ ئەگەر دواپیتی وشەی پێشوو بۆ ئەوە دەستبدا ] وەك (کتێبی قوتابخانە) یا (کتێبی تازە) •

١٦ ـ (و)ی عەتف بەجیا لە وشەی پێشووی بەڵام لەپاڵیا ئەنووسرێ وەك (منو تۆ) ، (گوڵو ڕێحانە) ، بەڵام ئەگەر وشەی عەتفکراوو وشەی عەتفکراوەسەر بووبوون بە یەك وشە ، ئەوە پێکەوە ئەنووسرێن‌و (و)ی عەتفەکە ئەلکێنرێ بە وشەی یەکەمەوە وەك (گفتوگو) ، (کشتوکاڵ) ، (نانوڕۆن) •

ئەمانەی کۆبوونەوەکەی دەستەی کوردی سەر بە کۆڕی زانیاری عێراق بڕیاری‌دابوون ، تێکرا ، پەسەندن‌و زۆرتریشیان یا خەڵك خۆیان بە دەستپێشخەریی کەساتێکی گوم‌ناو لەمێژە لەسەریان ڕۆیشتوون ، یا کۆڕی زانیاری کورد خۆی بڕیاری‌داون‌و ، کۆبوونەوەکە تەنها جەختی لەسەرکردن‌و لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی بۆ ماوەتەوە • بەڵام هەندێ بۆچوونی‌تر هەن کۆبوونەوەکە بڕیاری‌داون ، لەم ١٥ ساڵەی ڕابوردوودا لە کۆبوونەوەکەوە تا ئەمڕۆ ، نە ژیان بە ڕاستی دەرکردوون‌و نە توانیویانە خۆیان بچەسپێنن‌و نە بەڵگەی زانستیی متمانە بە دڵ پەیداکەریشیان بۆ پیشان‌دراوە تا لە بەرانبەری ڕەخنەدا وەڵامیان هەبێ‌و بتوانن خۆیان بگرن • لەبەرئەوە ئەبێ بیریان لێ بکرێتەوەو لە بەر ڕووناکیی تاقیکردنەوەی ئەم ١٥ ساڵەو لەوەپێشیش‌و گەشەکردنی ئەم ساڵانەی دوایی نووسینی کوردییا بڕیاری گونجاویان لەبارەوە بدرێ •

بنەمایەکی سەرەکی لە ژیانا هەیە ئەبێ بەر لە هەرچی لە مەیدانـــــی چەسپاندنی چۆنیەتیی ڕێوشوێنی نووسینی کوردییا ڕەچاو بکرێ ، ئەوەیش ئاسانکردنی چەند لەتواندا بێی نووسینی کوردییە • من لەم باری سەرنجانەما کە لێرەدا ئەیانخەمە پێش چاو ، بە خەیالی خۆم ، ئەم بنەمایەم ڕەچـــــاو کـــردوە •

١ ــ لە مەیدانی نووسینو نەنووسینی نیمچە بزوێنـــی ژێر (کسـرة)ی فرەکورتا ، کە دیارە ئەبێ لە تاقیکردنەوەی موختەبەریدا بڕیاربدرێ کـــام نیمچەبزوێنە کورت یا فرەکورتە ، من جیاوازییەك لەنێوان ژێری دوای (ن)ی (نیە)و (پ)ی (پیاز)دا بەدی ناکەم • ئێستا زۆرتری خەڵك وشەی (نیە) بــە دوو بڕگە ئەنووسن واتە ئەنووسن (نی‌یە) • لەم ساڵانەی دواییاو بەتایبەتی لەناو بنووسە کوردەکانی ئورووپاماناو تا ڕادەیەك لە کوردستان خۆیشـــیا هەردوو بڕگەکە پێکەوە ئەنووسن : (نییە) • من وای بۆ ئەچم هیچ کـــام لەم دوو ڕێبازە پێویست نەبـــێو سووكو ئاســـان بنووســـین ( نیە ) وەك پێشینانمان وایان ئەنووسیو ، گوێ بەوە نەدەین کە وشەکە لە دوو بڕگـــە پێکهاتووەو لە بەرانبەریا (هەیە) هەیە کە ئەویش دوو بڕگەیـــەو هـــەردوو بڕگەکەی بەجیا بەڵام لەپاڵ یەکا ئەنووسرێن ، ئەگینا ئەبێ هەرچی وشەمـــان هەیە لەسەر بنەمای چەند بڕگەییان پارچە پارچەیان بکەین • ئەگەر ئەمەمان بڕیار دا ئەبێ بیکەین بە بنەمـــاو بەسەر هەموو هاوچەشـــنێکیای پراکتیکـــە بکەینو ، ئەگەر حاڵەتێکی هاوچەشنمان هاتەڕێ بنەماکەی خۆمان تێك نەدەین بۆیو بۆ ئەویش بنەمایەکیتر بڕیار نەدەین •

٢ ــ لە مەیدانی نووسینو نەنووسینی نیمچەبزوێنی بـــۆر (ضـــمة)ی فرەکورتیشا ، کە دیارە ئەبێ ئەمیش هەر لە تاقیکردنەوەی موختەبەریـــــدا بڕیاربدرێ کام نیمچەبزوێنی (بۆر) کورت یا فرەکورتـــــە ، دیسان مـــــن جیاوازییەك لە نێوان بۆری دوای (ش)ی (شوان)و (ج)ی (جوان)و (د)ی (کردوە)دا بەدی ناکەم • ئێستا زۆرتری خەڵك لە کوردســـتان (شـــوان)و

(جوان)و هاوچەشنەکانیان بە یەك (و)و ، (کردووە)و هاوچەشنەکانی بە دوو (و = وو) ئەنووسن • من لام وایە ڕاستترە چ لەم نموونەو چ لە نموونەی بابەتی پێشوویشا ئەو نیمچە بزوێنانە هەر بە (زەنە = سکون) دابنێین‌و ، وەك لەوا وتمان تەنها یەك (ی) بنووسین ، لەمیشا تەنها یەك (و) بنووسین وەك (جوان)و (شوان)و (کردوە)و (بردوە)و •• تاد •

٣ ــ (ی)ی ئیزافە لە وشەیەکا خۆیشی (ی) بە ئاخرەکەیەوە بێ ، بەشی زۆری خەڵك گوێی نادەنێ‌و ناینووسن • ئەوانەیشیان کە ئێستا ئەینووسن ، زۆرتریان بە سەربەخۆیی ئەینووسن وەك لەم نموونەدا (ئاشتیی کوردستان) کە یا ئەنووسن (ئاشتی کوردستان) یا (ئاشتیی کوردستان) • تەنانەت لە کتێبی لەچاپدراوی (ڕاسپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی[١٤])و (ڕێنووسی کوردی بەپێی بڕیارەکانی کۆڕی زانیاری عیراق دەستەی کورد[١٥])یشا ، لەگەڵ ئەوەیش کۆبوونەوەکە بڕیاری نووسینی ئەو (ی)یەی دابوو ، گوێی نەدراوەتێ‌و لە زۆر شوێنی پێویستا نەنووسراوە • ئەم (ی)یە پێویستە بنووسرێ‌و جەختی لەسەر بکرێ پشتگوێ نەخرێ‌و بیشلکێنرێ بە (ی)کەی دوای وشەکەی پێشییەوە •

٤ ــ (ی)ی ضەمیری تاکی نادیار لەدوای وشەیەکی وەك (چی)یەوە ، لەگەڵ پێویستییشیا ، کەس ناینووسێ • بۆنموونە ئەنووسن (چیم وت ، چیت وت ، چیان وت ، چیتان وت) واتە لە هەموویانا ضەمیرەکانی تەکی ئەنووسرێن ، کەچی لە حاڵی ضەمیری تاکی نادیارا وەك (چی وت) واتە فلان کەس چیی وت ، هەر (ی)ی (چی)یەکە ئەنووسرێ • ئەمە دیارە هەڵەیەکی زەقەو ئەبێ هەردوو (ی)کە ، واتە (ی)ی (چی)و (ی)ی ضەمیری تاکی نادیار هەردوکیان بنووسرێن • یا لە ڕستەیەکی وەك (پیاوەتیم کرد) یا (پیاوەتیت

---

(١٤)و (١٥) بڕوانەرە : پەراوێزی ژمارە ١١ .

کرد) یا (پیاوەتییان کرد) یا (پیاوەتیتان کرد) یا (پیاوەتیمان کرد)ا ضەمیرەکانی دوای وشەی (پیاوەتی) هەموو ئەنووسرێن ، کەچی لە (پیاوەتی کرد)دا (ی)ی ضەمیری تاکی نادیارەکە نانووسرێ • ئەمەیش هەروا ڕەوا نیەو ئەبێ (ی)ی ضەمیری تاکی نادیارەکەیش لەگەڵ (ی)ی وشەکەی پێشەوەیا بنووسرێ ، واتە بنووسرێ : (چیی کرد) یا (پیاوەتیی کرد) •

٥ ــ گەورەترین تێگلانی کۆبوونەوەکەی کۆڕ لە مەسەلەی چۆنیەتیی نووسینی وشەی ناسادەدا ڕوویداوە • کۆبوونەوەکە بڕیاریداوە وشەی ناسادە ئەگەر ناو بوو یا زاراوە بوو بە یەك پارچەیی بنووسرێ وەك (چەمچەماڵ)و (دەسنووس)و لەمە بەولاوە هەرچییتر بوو بە جیاجیا بنووسرێن • من لاموایە ئەمە بنەمایەکی تەواو نیە ، چونکە هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەم نموونانەدا نیە ببێ بە مایەی ئەوە هەر یەکەیان حوکمێکی جیاوازی هەبێ :

(دڵسۆز) پیاوێکی چاکە — من پیاوێکی (دڵسۆزم)

من بە (کرێکاری) ئەژیم — من بە (چیرۆكنووسین) ئەژیم

بۆ پێویستە لە نموونەی یەکەما وشە لە بنەڕەتا دووپارچەکە بەیەکەوە بنووسرێ‌و ، لە نموونەی دووهەما ڕەوا نیە ؟ وشەی (دڵسۆز) لە دوو وشەی (دڵ)و (سۆز) دروستکراوە • لە هەردوو نموونەکەدا مەعنای سیفەتی دڵسۆزی هەیە ، بەڵام لە نموونەی یەکەما کە وشەکە کراوە بە ناو ئەو مەعنای سیفەتی دڵسۆزییە پشتگوێ خراوەو لەبیربراوەتەوە • ئەگەر بڵێین هەر لەبەر ئەمەیە ئەبێ (دڵسۆز)ی یەکەم بە یەك پارچەو (دڵسۆز)ی دووهەم بە دوو پارچە بنووسرێن ، خۆ لە نموونەی دووهەما لە هەردوو وشەی (کرێکاری)و (چیرۆكنووسین)دا سیفەتەکە مەبەستە • جا ئاخۆ

ڕەوایە بڵێین کورد لەو ڕۆژەوە کە دەستی داوەتە نووسین بە کوردی ، وشەی (کرێکار)ی بەهەڵە نووسیوەو ئەبوو بینووسیایە (کرێ‌کار) ؟ باوەڕ ناکەم •

نموونەیەکی‌تری بەهەڵەچوونی کۆبوونەوەکە لە هەندێ لە بڕیارەکانیا لەبارەی وشەی ناسادەوە ، لە مەسەلەی هەڵوێستیایە لەبارەی ئەو پێشگرانەوە ئەکەونە سەر فرمان (فعل) • بۆنموونە وشەیەکی وەك (هەڵبەزین) یا (دابەزین) لە پێشگری (هەڵ) یا (دا)و فرمانی (بەزین) پێکهاتووە • فرمانی (بەزین) بەم لێ‌زیادکردنی (هەڵ) یا (دا)یە مەعنای بەتەواوی جیایە لەو (بەزین)ەی ئەم پێشگری (هەڵ) یا (دا)یەی ئەچووبێتەسەر • لە کوردیدا ژمارەیەکی زۆر فرمانی‌وا هەن بە پێشگرەکەیانەوە واتایەکی جیا لە واتایان بێ پێشگرەکە ئەبەخشن‌و بوون بە فرمانێکی سەربەخۆو ، تەنانەت لە فەرهەنگیشا ئەبێ هەر یەکەیان لە شوێنی تایبەتیی خۆیا بەدوایا بگەڕێی • ئیتر بۆ ئەبێ پێشگرەکەیان بەجوێ لە خۆیان بنووسرێ ؟ هەموومان واتای هەر کام لەم کارانە بێ‌پێشگرەکانیان‌و لەگەڵ پێشگرەکانیانا ئەزانین‌و ئەتوانین بەئاسانی لێکیان جیابکەینەوە ، بەڵام کێ ئەتوانێ واتای ئەو پێشگرە بزانێ بە سەربەخۆیی چی ئەگەیەنێ ؟ بۆیە من لام‌وایە ئەمەی کۆبوونەوەکە بڕیاری‌داوە کە ئەم پێشگرانە بەجیا بنووسرێن ، هەڵەیەکی گەورەیەو ئەبێ لەگەڵ وشەی فرمانی پاشەوەیان پێکەوە بنووسرێن •

وشەیەکی وەك (دەسنیشان‌کردن) کە کۆبوونەوەکە بڕیاری‌داوە بە سێ پارچە (دەس + نیشان + کردن) بنووسرێ ، ڕاستە لە بنەڕەتا لەم سێ وشەیە پێکهاتووە ، بەڵام لەوەیش ڕاستتر ئەوەیە کەوا لە (دەسنیشان + کردن) پێکهاتووە • دیسان ، ڕاستە (دەسنیشان) لە بنەڕەتا (دەس)و (نیشان)ە ، بەڵام ئێستا واتایەکی سەربەخۆی‌وای هەیە تەنانەت (دەس)و (نیشان)یش پێکەوە ، بێ‌کردنیان بە یەك وشە ، بەلایا ناچن • کەواتە

کۆبوونەوەکە لە بڕیارەکەیا کە ئەم وشەیە بە سێ پارچەی جیاجیا بنووسرێن ، کەوتوەتە هەڵەوەو ئەبێ بە یەك پارچە بنووسرێن بەمجۆرە :(دەسنیشانکردن)•

من وای بۆئەچم بنەمای ڕاست لە نووسینی وشەی لە دوو پارچە یا زیاتر دروستکراوا ئەوەیە مادەم ئەو وشەیە بە گشت پارچەکانیەوە یەك واتا بگەیەنێ ، با هەر پارچەیەکیشی بۆخۆی واتای تایبەتیی هەبێ ، هەر ئەوەندە پیتەکانی پێکەوە بنووسێن ، ئەبێ پێکەوە بنووسرێن وەك (چەمچەماڵ) ، (چێشتلێنان) ، (عەرزوحاڵنووسین) ، ئەگینا یەك وشە نابێ‌و بە جیاجیا ئەنووسرێ وەك (کوردستانی عێراق)و (من عەرزوحاڵ نانووسم) •

٦ ــ لەبارەی وشەی عەرەبییەوە کە هاتبێتە زمانی کوردییەوە ، وتمان کۆبوونەوەکە بڕیاریداوە ئەبێ ئەو وشانە لە هەموو ڕوویەکەوە مامەڵەی وشەی کوردییان لەگەڵ بکرێ‌و وەك هەر وشەیەکی کوردی بنووسرێن • وتیشمان ئەمە لەبارەی سەرو بۆرو ژێرو شتی‌وایانەوە بەتەواوی لە جێی خۆیایەتی • بەلام گۆڕینی پیتە عەرەبییەکانیان بە پیتی کوردی لە جێی خۆیا نیە • لە عەرەبییا گەلێ پیت هەن لە کوردیدا نین‌و بەپێچەوانەیشەوە • گۆڕینی پیتی عەرەبی بە پیتێکی کوردی کە نزیك بێ لێیەوە وەك گوڕینی (ث)و (ص) بە (س)و ، (ذ)و (ض)و (ظ) بە (ز)و ، (ط) بە (ت) ، هەمان کارە کە عەرەب تا ئێستا لەگەڵ پیتی کوردی‌و فارسی کردوویانەو وا ئێستا خەریکن لێی پەشیمان ئەبنەوە • ئێمەو عەرەب‌و فارس‌و بەشێکی زۆری گەلە موسوڵمانەکان بە پیتی عەرەبی ئەنووسین • لەبەرئەوە لە ناسینەوەی هیچ پیتێکی عەرەبییا هیچ گیروگرفتێکمان نایەتەڕێ‌و لەمەدا حاڵمان لە گەلانی ڕۆژاوا زۆر باشترە کە کاتێ ناوێکی عەرەبی لە تێکستێکا بەکاردێنن ئەگەر هەندێ لە پیتەکانی ئەو ناوەیان لا نەبێ ناتوانن ناوەکە بە ڕاستی وەربگرن • ئێمە وا نین • کابرایەکی عەرەب ناوی (نذیر)ە ، کابرایەکی‌تریش ناوی (نظیر)ە • کابرایەك ناوی (حارث)ە ، کابرایەکی‌تریش ناوی (حارس)ە • ئەگەر

ئێمه له بەکارهێنانی به زمانی خۆمانا بیانکەین به (نەزیر)و (حاریس) ، کــێ چوزانێ یەکەمیان له عەرەبییا (نذیر) بوه یا (نظیر) و دووهەمیان (حارث) بوه یا (حارس) ؟ له کاتێکا که ئێمه چونکه شارەزای هەموو پیته عەرەبییەکانین ئەگەر (نذیر) به (نەذیر) بنووسین‌و (حارث) به (حاریث) هیچ گرفتێکمان نایەتەڕێ • شیعرێکی کلاسیکی کوردی که لەم جۆره پیتانەی تێکەوتبێ ، چۆن بتوانین بێ‌هەڵه واتای لێ‌بدەینەوه ئەگەر ئەو وشانەی ئەو پیتانەیان تیایه ، به وشــه کوردییه نزیکەکانیان نووسرابن ؟ بۆیه من لام‌وایه ئەو وشه عەرەبییـــانەی هاتوونەته کوردییەوه ، لێیان وردبینەوه ، ئەگەر بەو ســیفەته بەکارهێنرابن که کوردین ئەوه به پیتی کوردی ئەیاننووسین وەك ئــەوه که بنووســین (عوسمان‌بەگی جاف) هەرچەند وشەکه له بنەڕەتا له (عثمان)ی عەرەبییـەوه هاتووه ، (ث)کەی ئەکەین به (س) • ئەگەریش به سیفەته عەرەبییەکــەی بەکاری‌بهێنین وەك ناوی خەلیفەی سێهەم ، ئەوه ئەبێ بنووسین (عوثمانــی کوری عەففان) واته به پیتی عەرەبی‌و شێوەنووسینی کوردی • بەم جــۆره هەم پیته عەرەبییەکان به شــێوەی ڕاستی خۆیــان ئەنووسین‌و هەم تێکڕای وشەکەیش به شێوەنووسینی کوردی ئەنووسین •

٧ ــ یەکێکی‌تر لەو بۆچوونانەی کۆبوونەوەکه که لام‌وایه هەڵــەن‌و کەساتێکی کەمیش نەبێ پێڕەویی لێ ناکەن ئەو بڕیارەیه لەبارەی چۆنیەتیــی نووسینی ضەمیری لکاوەوەیه لەگەڵ فرماندا • ئەوەته بڕیاری‌داوه ضەمیری لکاو ئەگەر بەدوای نیشانەی ڕێژەی (ده)و (ب) یان ئەداتی نەفی‌و نەهیــدا هات ، له فرمانی سادەی ڕانەبووردوو ، داخوازی ، به مەرجێ فرمانی تێپەڕ بێ ، له شێوەی ئیثبات‌و نەفیدا ، ئەلکێنرێ به پێشەکەیەوه ، بەڵام بــــه فرمانەکــەوه نالکێنـــرێ • بۆنموونــه ئەنووســرێ : (بم‌نووســی‌بایه)و (نەم‌نووسی‌بایه)و •• تاد •

هەروەها بڕیاری داوه ضەمیری لکاوی کەوتووه نێوان پێشگرو ڕەگی فرمانەوه ، له هەردوو شێوەی ئیثبات‌و نەفیدا ، ئەلکێنرێ به پێشــگرەوەو

نالکێنرێ بە ڕەگی فرمانەکـەوە • بۆنمـوونە ئەنووسـرێ (هەڵم گـرت • هەڵیان بڕی)و نانووسرێ (هەڵمگرت)و (هەڵیانبڕی) •

بە بۆچوونی من ، لەبەرئەوەی ئەم پێشگرو ضەمیرانە بەتەنها خۆیـان هیچ واتایەك نابەخشن و واتاگەیاندنیان بەستەیە بە نووسانیان بە ڕەگـی فرمانەکەی پاشیانەوەو ، دوور لـە هەموو بروبیانوویـەك بۆ پاساودانـی بۆچوونەکەی کۆبوونەوەکە ، پێکەوە ئەنووسرێن و ، مادەم پیتیوا لەئـارادا نەبێ لەسەرێکەوە نەنووسێ بە پیتیترەوە ، لێك جوێ ناکرێنەوە •

٨ ــ بە بۆچوونی من بڕیارێکی هەڵەی تری کۆبوونەوەکە ئەوەیە کە ئەڵێ هەر وشەیەك کۆتاییی بە پیتەبزوێنی (ی) یا (ێ) هاتبێ ، هەر شتێکیتـری بەدوادا بێ ، (ی)یەکی نەبزوێنی ئەخرێتە تەك و بەجیا لە نزیکی وشـەی یەکەمەوە ئەنووسرێ ، بۆنموونە : پێڵاوەکەم نوێیە ، هەرمێیەکم بدەرێ ، سێیەمین کەس •

من لام وایە هەرچەند تا ئێستا لە هەندێ نموونەدا خەڵك بەم جـۆرە ئەنووسن کە کۆبوونەوەکە بڕیاریداوەو لە هەندێ نموونەیترا نە ، ئـەم بڕیارە ، بەش بەحاڵی زیادکردنی (ی)یەکی نەبزوێن ، تەنها لە وشەی بـە (ێ) دواییهاتووا جێبەجێ بکرێ و ، لە وشـەی بە (ی) دواییهاتـــووا مەسەلەکە لەسەر ئەوە بوەستێ ئاخۆ پیتە بزوێنەکەی پێش (ی)کە بۆ ئـەوە ئەشێ بڵێین (زەنە = سکون)ی هەیە یا نە ؟ ئەگەر بـۆ ئەوە شـیا ، (ی) نەبزوێنەکەی نەخرێتەتەك و ئەو دەورەی کۆبوونەوەکە بۆ (ی) نەبزوێنـە خراوەتەکەکەی ڕەچاو کردوە بەو (ی) ئەسلییە بسپێررێ وەك لە نموونـەی (نیە)دا کە پێشتریش باسمان کرد • هەرچی مەسەلەی بەجیـاو لەنزیکـەوە نووسینیشە ، ئەوە لە هیچ حاڵێکا پێویست نیەو کورتترو ئاسانتر ئەوەیـە وشە بە پیتە بزوێن دوایی هاتوەکەو پاشبەندەکەی پێکـەوە بنووسرێن وەك (پێڵاوەکەم نوێیە)و (هیچ پێویستیەکم نیە) •

٩ ــ کۆبوونەوەکە هەروا بڕیاریداوە (دا)ی پاشگر نەنووسێنرێ بە وشەی پێشەوەی • من ئەمەیشم لا هەڵەیەو تەنها (دا)ی فیعل نابێ بنووسێنرێ بـە وشەی پێشیەوە • من لەمبارەوە ئەم بنەمایە دائەڕێژم : هــەر پێشـــگرو پاشگرێ بە سەربەخۆیی واتا نەبەخشێ ، ئەبێ بنووسێنرێ بە پاش یـــا پێشەکەیەوە ، چونکە واتابەخشینی بەسراوە بەو وشەی پاشی یا پێشیەوە •

پاش ئەم پێداچوونەوەو ڕادەربڕینیە ، ئەمــەوێ هەل لەکیــس نەدەمو باسێکی ئەوەیش بکەم کە وەك ئەو گشتە قسەیە لەسەر (و)ی درێژ کراوەو ئەنجامەکەی گەیشتوەتە ئەوە ئەمڕۆ تێکڕا بە دوو (و = وو) ئەنووســرێ ، هەروەها بابەتی (ی)ی درێژیش هەیە کە لایەکی ئەوتۆی لێ نەکراوەتەوە •

(ی)ی درێژ کە من ، بەشبەحاڵی خۆم ، نەمدیوە بکەوێتە سەرەتــای وشەوەو ، تەنها لە نێوانو دواییــی وشــەدا هەیــە وەك (چیــت کــرد)و (ئەلێی چی) ، لە نێوانــی وشــەدا هیچ گیروگرفتێ پێکناهێنێ چونکـــە (ی)ی کورت نیە بکەوێتە نێوانــی وشـــەوەو هەرچی هەیە یا (ی)ی درێژە یا (ێ)ی بۆشە کە هەردوکیان دوو نوختەیان لەبنەوە دائەنرێو بۆشەکەیــان بە (v)ەکەی سەری لە کورتەکەیان جوێئەکرێتەوە • ئەوەی ئەبێ چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە ، ئەو (ی)ی درێژەیە ئەکەوێتە دوایی وشەوەو هەندێ کەس بە دوو (ی)ی ئەنووسنو ، کە ئەو وشەیە ئیزافەیش کرا یا درایە پـــاڵ وشەیەکیتری لەپاشەوەی ئەبێ (ی)یەکیتریشی بخرێتە تەك •

جا چونکە (ی)ی دواییــت لە وشــەدا یا (ی)ی درێــژە وەك (ی)ی (پیاوەتی)و (کوردایەتی)و •• تاد یا (ی)ی کورتە وەك (ی)ی ئیزافە یـــا دانەپاڵ وەك (کوردی عێراق)و (کوڕی ئازا)و ، لەبەر نەبوونی نیشانەیەکیش (ی)ی درێژ لە (ی)ی کورت جوێبکاتەوەو ، (ی)ی دواییش لەکوردیدا بە بێنوختە ئەنووسرێ ، من ، کە دەمێ ساڵە بیر لەم مەسەلەیە ئەکەمەوە ، وام بەبـــیرا هاتــوەو ، جارێکــیتریــش ئــەم بــۆچــوونەی خۆمــم لــە

نووسینێکما پێشنیا کردوه[16] : (ی)ی درێژی دوایی وشه به دانانی دوو نوخته لەبنەوەی له (ی)ی ئیزافه یا دانەپاڵ جۆیبکرێتەوەو له نموونەی یەکەما بنووسین (پیاوەتی)و له نموونەی دووهەما بنووسین (کوڕی من) یا (کچی جوان)و ، بەمجۆره به بوونو نەبوونی ئەم دوو نوختەدا دەرئەکەوێ کام (ی)ی دوایی (ی)ی درێژەو ، کامه (ی)ی کورته • ئەوەیش بزانین کەوا ئێستایش که هێشتا ئەم پێشنیایەی من پەسەندو جێبەجێ نەکراوه ، هەر (ی)یەکی درێژ که (ی)ی ئیزافه یا دانەپالی بەدوادا بێت ، بەو کەوتنە پێشەی له دواییت له وشەکەدا ئەبێ به خاوەن نوختەو دوو نوختەی لەژێرەوه دائەنرێ •

شتێکیتریشتان عەرزبکەم که زیاتر پێوەندی به پیتی (ی)و کەمێك به (ت)یشەوه هەیه ، ئەویش ئەوەیه کە لەبەرئەوەی لە کۆبوونەوەی دوو (ی) یا زیاتر یا دوو (ت) له ناوەوەی وشەدا ڕیزێ نوختە ئەکەونه پاڵیەكو لەوانەیه سەر له خوانا تێکبدەن ، من پێشنیا ئەکەم دوو نوختەکەی (ی)و (ت)، لەجیاتیی ئەوەی شانبەشانی یەك بنووسرێن ، سەروخوارو ستوونی بنووسرێنو ، بەمه ئەو پیتانه تارادەیەك لێك دوورئەخرێنەوه •

ئەمانەی عەرزم‌کردن چاوگێڕانەوەیەکی کورت بوون به بڕیارەکانی کۆڕی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردیدا که دەستەی کوردی سەر به کۆڕی زانیاری عێراق له ڕۆژانی ١٨ ــ ١٩/١٢/١٩٨٥دا له بەغدا سازیکردو ، لام‌وایه بابەتەکه لێدوانی گەلێ لەمه تێروتەسەلتری پێ ئەوێو ئاواتەخوازم ئەم کاره به زوویی بەئەنجام بگەیەنرێو ڕۆژێ زووتر بگەیەینه ئەوه که شێوەنووسینێکی بەڕاستی پوختو بێ‌گرێوگۆڵو بەڕاستی یەکگرتوومان هەبێ •

---

(١٦) بڕوانەره : محمدی مەلاکریم ، بیری کۆمەلایەتیو سیاسیی پیرەمێرد ...، له بلاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی ، بەغدا ، چاپخانەی ( دار الحرية ) ، ١٩٩٢ ، ل ٩١ ــ ١٢٢و ل ١٢٥ .

بە هەر حاڵ ، من لە هەندێ لەم پێشنیایانەی خۆیشما هێشتا دوودڵم‌و
گەلێ جار بە جۆرێ ئەنووسم‌و پاشان ئەیگۆڕم بە جۆرێکی‌ترو تائێستایش
نەمتوانیوە لە هەندێ بابەتا بگەمە بڕیاری یەکجاری • لە مەسەلەی (ئـە)و
(دە)دا دوودڵم ، هەرچەند لەوە دڵنیام کە گرانی (دە) بە (ئە) ، وەك لە شیعری
(نالی)و (مەحوی) یەوە دەرئەکەوێ ، هەنگاوێکی پێشکەوتوو بوە بـە
ڕێگای ئاسانکارییا • لە مەسەلەی نووسینی پیتە قووتدراوەکانا دوودڵـم •
ئاخۆ بنووسرێ : تیا ، یا بنووسـرێ : تێداو هەمـوو هاوچەشنەکانـی ؟
بنووسرێ : لە باخەڵیا ، یا بنووسرێ : لە باخەڵیدا ؟ بنووسرێ : ئەبێ ، یـا
بنووسرێ : ئەبێت ؟ بنووسرێ : بخۆی ، یا بنووسرێ : بخۆیت ؟ لەبـارەی
بۆرو ژێری فرەکورت‌و کورتەوە دوودڵم • ئاخـۆ بنووسـرێ : کـردوە ،
نـووسـتوە ، یـا بنووسـری : کـردووە ، نووسـتووەو
هـاوچـەشـنەکانیـان • بنووسـرێ : ئـەم کتێبـە کـوردیـە ،
یا بنووسرێ : ئەم کتێبە کوردییە ؟ لەوانەیە بابەتی‌تری لەم چەشنەیش هەبێ •
تەنـانـەت لـەم بـابەتـەی بـەردەسـتیشـتانـا نـەمتـوانیـوە
بـەتـەواوی یەکـێ لـە هیچ‌کـام لـە دوو بۆچـوونە دژبەیەکەکـان
بکەم بـە شـێوەنووسـینی هەڵبـژاردەی خـۆم • ئەمانـە گشـت
پێویستیان بە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەیە تا سنووری نێوان (زەنە)و (بۆر)و
(ژێر) بەوردی دەسنیشـان بکرێ • مـن داوا لـە هەموو ئەو بـرادەرانە
ئەکەم خۆیان لەم‌بارەوە بە لێهاتوو ئەزانن بەکاوەخۆ لە مەسەلەکە بکۆڵنەوەو
توێژینەوەی بێ‌لایەنانەی تیا بکەن‌و چییان بە دڵا دێ‌و ، ئەگەنە چ ئەنجامێ ،
بیخەنە بەردەستی خوێندەواران‌و بەتایبەتی ئەوانەی بەم بابەتەوە خەریکن ،
تا پاش ئەوەی کۆمەڵێکی باش توێژینەوەمان هاتە بەر دەست ، ئەو کاتـە

له جێی خۆیا ئەبێ خاوەنەکانی ئەو لێکـــدانەوەو لێکۆڵینەوانەو هـــەر کەسێکی‌تری بە خۆدا پەرموەوە کۆبوونەوەیەکی بەربلاوی بێ‌هەراوزەنای بۆ سازبدەن‌و مەسەلەکان بخەنە سەر مێزی یەکالاکردنەوەو هـەر کەســە تاقیکردنەوەی خۆی عەرزی کۆبوەوەکان بکاو ئەو ئەنجامەی پێی‌ئەگـەن بە جەماوەری ڕۆشنبیران‌و خوێندەوارانیا ڕاگەیەنن •

# هەندێ سەرنج و تێبینی
# دەربارەی نووسینی کوردی
# بە ئەلفوبێــی عەرەبی

محەمەد زەهاوی

ئەگەر چاوێك بە مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیـــدا بگێڕین ، ئەوەمان لێ ئاشکرا دەبێت ، کە دەمی ســاڵە نووسەرانــی کــورد کێشەی چۆنیەتی نووسینی زمانەکەیان لەبەرچاو گرتووە و هەوڵی نەهێشتنی گیروگرفتەکانیان داوە تا لە پاشاگەردانی ڕزگاریان بێ و ئەلفوبێی عەرەبی وا لێ بکەن بتوانێ دەنگە کوردییەکانی بــە جۆرێکــی وا پێ‌دەربڕێ ، خوێندەواری کورد بتوانێ ئەوەی دەیڵێ بیخاتە سەر کاغەز •

کۆترین دەستنووس و چاپکراوە کوردی‌یەکان ، ئەوە دەگەیەنن کــە نووسەرانی کورد ، وەك فارسەکان و گەلانی دی ئیسلام بۆ هەندێك لــەو دەنگە کۆنسۆنانتانەی لە زمانی عەرەبیدا نەبوون و لە ئەلفوبێ‌یاندا نیگاریان دەست نەکەوتووە ، بە دانانــی سێ خــاڵ ، وەك : ( پ ، چ ، ژ ، ڤ ••• ) یاخود دانانی خەتێك وەك (گ) چاریان کردووە •

دوای ئەو پلەیە ، ئەوەی لە دەستکاری‌کردنی ئەو ئەلفوبێ‌یەدا دەبینرێ، ئەوەیە کە نیگاری (ە) و (ی) و (و) بۆ سەر و ژێر و بۆر بەکارهێنراوە •

دوو نیگاری نوێی دی دووو واو نووسینە بۆ دەنگی بزوێنی ( U )
و دوو (ی) بۆ ــ بزوێنی ( I ) ی تیژ •• بە دوا ئەمانەشدا بۆ هەندە
نیگاری (ئـ) و بۆ لامی قەڵەو (ڵ) و بۆ ڕای قەڵەو (ڕ) دانران •

هەرچەندە هەوڵ و کۆششی زانایانی کورد و کوردناسان لەو مەیدانەدا
جێی خۆی گرتووە و ئەمڕۆ ڕێنووسێکی تا ڕادەیێك باش بۆ نووسینی
کوردی ساز بووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئەلفوبێیەی ساڵەهای ساڵە
خزمەتی دەکرێ هێشتا گیروگرفتی زۆری تێدایە ، کە ئەوانیش دەکرێ
(گیروگرفتی نیگاری دەنگەکان ) ، یاخود ( گیروگرفتی نووسینی
وشەکان و تێك بەستنیان ) بن •

بەپێی سەرنجدانمان ، بۆمان دەرکەوت کە وێنەی دەنگی بزوێنی (و)و
(ی)ی درێژ و کورتە بزوێنی ( i ) و کۆنسۆنانتی (و) و (ی) و
دیفتۆنگی (وێ) و کۆنسۆنانتی (ڕ) قەڵەو لە ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردیدا
گیروگرفتیان هەیە و کێشەیان لەسەرە و پێویستیان بە چارەسەرکردنە :

١ــ دەنگی بزوێنی (و) ی درێژ کە لە ڕێنووسدا بە دوو واو ، یان
(و ــ کەشیدەیەکی لەسەر) دەبینرێ ، هەردوو نیگارەکە باش نین • یەکەمیان
ــ واتە دوو واو نووسین ــ لە ڕووی زانستی زمانەوە هەڵەیە ؛ دووەمیان
ــ واتە (و ــ کەشیدەیەکی لەسەر) شێوەی ناحەزە ، بۆیە ئەم دەنگە
پێویستی بە نیگارێکی نوێی گونجاوە •

٢ــ هەڵەی نووسینی دوو (ی) ، یان (ی ــ کەشیدەیەکی لەسەر)
بۆ دەنگی بزوێنی (ی ــ ( I ) ) لەوەدایە ، یەکەمیان پەیڕەوی یاسای
فۆنەتیکی تێدا نەکراوە و دووەمیشیان شێوەی نالەبارە • جا لەبەر ئەوەی
هیچ کامێکیان لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ناگونجێن ، پێویستە
لە بیر ببرێنەوە •

٣ــ نەبوونی نیشانە بۆ کورتە بزوێنی ( i ) و کۆنسۆناتــــی و ( W ) ی ( Y ) بووەتە هۆی کێشەیەکی گەورەی ڕێنووســی کوردی و ئەم ناتەواوییە ، نــەك هەر ســەری لە قوتابیان ، بەڵکو لە هەندێ زمانەوانیش تێك داوە • لەبەر ئەوە دانانی نیگار بۆ ئەو دەنگانە کارێکــی زۆر پێویستە لە نەهێشتنی کەموکورتیی ئەو ڕێنووسەدا •

٤ــ دیفتۆنگی (وێ) ، کە هەندێ کەس بە (و ــ کەشیدەیەکی لەسەر) دەینووسن ، بە ناوەڕۆك هەڵە و بە ڕوخسار ناحەزە • ئەمە پێویســــتی بە دوورخستنەوەیە و نابێ لە هیچی نەبوو گیروگرفت پەیدا بکرێ •

٥ــ بۆ نیشاندانی قەڵەویی دەنگی (ر) ی قەڵەو لە هەموو ڕوویەکەوە نووسینی دوو (ر) هەڵەیە و دانانی چوکڵە ڕاستە ، هەرچی چوکڵەشە لـــە سەرەوە دانانی گیروگرفت پەیــدا دەکا و باشـــتر وایـــە وەك لـــە زووەوە ڕۆیشتووە لە ژێرەوە دابنرێ • دانەنانی چوکڵەش بۆ (ڕ)ی سەرەتـــای وشە ، کارێکی نازانستییانەیە •

بەو پێیە باشتر وایە :

أ) نووسینی دوو واو یان (و ــ کەشیدەیێکی لەسەر) بۆ بزوێنــی (و)ی درێژ لەگەڵ نووسینی (ی) ، یان (ی ــ کەشیدەیەکی لەسەر) بۆ بزوێنـــی (ی)ی هێزدار فەرامۆش بکرێ •

ب) وێنە بۆ بزوێنی (و)ی درێژ و کورتە بزوێنی ( i ) و کۆنسۆناتــی ( و ــ ( W ) ) و ( ی ــ ( Y ) ) بکێشرێ •

ج) نیگاری دەنگی (ی ــ ( i ) و (وێ) و (ڕ) زوو چۆن بـــوون وا بمێننەوە و ئەو دەستکارییانەی کراون لە بیر ببرێنەوە •

له باسی (گیروگرفتی نووسینی وشەکان و تێك بەستنیان)یشـــدا ، گەیشتووینەتە ئەم ئەنجامانە :

١ـ ئەو وشانەی بە دەنگی (و ( W ) )ی کۆنسۆنانت دەســـت پێدەکەن ، هەندێ لەو ڕایەدان کە بەیەك واو بنووسرێن و هەندێکیـــش نووسینی دوو واو پەسەنـــد دەکـــەن ... بەشێکیـــش لەوانـــەی دوو واو دەنووسن ، بە هەڵەدا چوون و وا تێگەیشتوون ، کە ئەو جۆرە وشانە بـــە بزوێنی (وو ـ ( U ) ) دەست پێدەکەن ، هەرچەندە کۆمەڵی دووەم لـــە ڕێگەی لێکدانەوەوە بۆ ئەوە چوون ، کە بە دوا دەنگی (و ـ ( W ) )ی کۆنسۆنانتی سەرەتادا کورتە بزوێنی (و ـ ( U ) ) دێت ، بـــەلام لێکۆڵینەوەی تەواویان نەکردووە ... بەر لە هەر شت گومان لەوەدا نییە ، کە ئەو وشانە بە بزوێنی (وو ـ ( U ) ) دەست پێناکەن ، چونکـــە وەك ئاشکرایە لە زمانی کوردیدا بزوێن لە سەرەتـــای وشـــەوە نایـــەت . سەرەڕای ئەوە ، ئەگەر بزوێن بوایە ، دەبوو (ئـ) لە پێشیانەوە پەیدا بـــێ ... بەڵێ دەنگی سەرەتای ئەو وشانە ( W ) ە ، دەبێ بکۆڵینـــەوە و بزانین دووەم دەنگ ( U ) ە ، یـــان ( i ) ە . جا کە گەیشـــتینە ئەو ئەنجامە ، ئەوسا دەتوانین بڕیار بدەین ، کە چۆن بنووسرێ ... من لەو ڕایەدام ، کە دەنگی دووەمی زوربەی هەرە زۆری ئەو جۆرە وشانە کورتـــە بزوێنـــی ( U ) ە ، بەلام لە ناویاندا وشەی ئەوتۆ هەن ، کـــە بە دوا ( W )ی کۆنسۆنانتدا بزوێنی ( i ) هاتووە ... بێ گومان لـــە ڕێگای ئامێری تایبەتی پێوانە و کێشانەی دەنگ و قووڵبوونەوە لە یاسای فۆنەتیکی زمانەکەمان ، باشترین ساغکردنەوەی ئەو کێشەیە دابین دەکرێ . بەو پێیە دەبێ لە پێشـــەوە هەنـــدێ کێشـــەی فۆنەتیکـــی زمانەکەمـــان ساغبکەینەوە ، ئەوسا بڕیاری نووسینی دوو واو ، یان یەك واو بدەیـــن :

ئەگەر ئاشکرا بوو ، کە بە دوا دەنگی (و ــ ( W ) )دا کورتە بزوێنی (و ــ ( U ) ) هاتووە ، ئەوە دەبێ بە دوو واو بنووسرێ • خۆ ئەگەر کورتە بزوێنی ( i ) ی بە دوادا بێت ، ئەو دەمە ڕاست وایە بەیەك واو بنووسرێ •

٢ــ ئەگەر وشەیەك کۆتایی بە بزوێنی (وو ــ ( U ) ) بێت و نیشانەیەکی بە بزوێن دەستپێکردووی پێوە بلکێنرێ ، ئەو دەمە لە نێوان وشە و نیشانەکەدا کۆنسۆنانتی (و ــ ( W ) ) دێتە کایەوە ••• ڕاستە لەم جۆرە حاڵەتانەدا بزوێنی (وو ــ ( U ) )ی کۆتایی وشەکە کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دەوترێت ، بەڵام ئەم دیاردەیە ، کە هۆی جێگۆڕینی هێز ، یان پێکەوە هاتنی دەنگی وێکچوو ، یان دەنگەکانی دەوروبەرە ، نابێ ببێتە هۆی شێواندنی بناغەی وشە ••• هەندێ کەس بێ ئەوەی بیر لە ئاکام بکەنەوە وایان بە باش زانیوە چۆن بە دەمدا دێت هەر بەو چەشنە بینووسن • لە سەرێکی دیکەوە نادروستیی نیگاری بزوێنی (وو ــ ( U ) نووسەرانی ناچار کردووە فەزڵی هەڵە بەسەر ڕاستدا بدەن • بۆ نموونە دەنووسن (جوانووەکە ، جووە ••• ) ، کەچی ڕاستەکەی (جوانوووەکە ، جوووە ••• ) یە • شێوەی نالەباری سێ واو بەدوا یەکدا هاتن وای لە خەڵك کردووە واوێکیان فڕێ بدەن • بەڵێ لە ڕووی ڕوخسارەوە دوو واو جوانترە و سێ واو بەیەکەوە نووسین ناشیرینە ، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆك و واقیعی زمانەوانییەوە دوو واو هەڵەیە و سێ واوە ناشرینەکە ڕاستە •

٣ــ کاتێ دوو دەنگی وێکچوو یاخود لێك نزیك دەکەونە پاڵ یەك و لە دەربڕیندا یەکێکیان ناوترێ ، ئەوە بەڕای من ڕاست نییە ، ئەو جۆرە وشانە لەسەر بناغەی تەلەفوز بنووسرێن ، بەڵکو لە نووسیندا پێویستە شێوەی پێکهاتنیان ڕەچاو بکرێ و ئەو پەڕاندن و ونبوون و تێکەڵاوبوونە

ڕەنگ نەداتەوە ــ واتە ڕاسترە بنووسرێ : (کورتتر ، پاککردن ، دەست کەوت ...) نەك (کورتر ، پاکردن ، دەسکەوت ..) .

٤ــ بێتو (ی)ی ئیزافە بخرێتە سەر وشەیێکی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ی) ، ئەو کاتە نیشانەی (ی)ی ئیزافە لە تەلەفوزدا دەرناکەوێ .. بێ گومان بۆ نیشاندانی باری ڕێزمانی و بوونی دۆخی ئیزافــە ، باشتر وایــە (ی)ی ئیزافەکە بنووسرێ ، جا با نەشخوێنرێتەوە ، واتە پێویستە بنووســــــرێ (ڕێویی قەمچووغە ؛ ماسیی گەورە .. ) ، نەك ( ڕێوی قەمچووغە ؛ ماســـی گــەورە) ..

٥ــ وەك دەزانین لە شێوەی سلێمانیدا دیاردەی گۆڕینی دەنگێك بــۆ دەنگێکی دی ، یان کلۆرکردنی دەنگێك ، یان تێداچوونی دەنگێك ، یــان قووتدان ، یان سوان ، یان قرتان ... زۆر پەرەی سەندووە . ئەگەرچی ئەم جۆرە بابەتە پتر کێشەی زمانی ئەدەبین ، بەڵام تا ڕادەیێك پێوەندییــان بە ڕێنووسیشەوە هەیە :

أ)  لە شێوەی سلێمانیدا کە (ت) کلۆر دەکرێت ، وەك کە دەڵێــــن « ئەمە .. (و) لەچی ؟ » لە بریتی «ئەمەت لەچی ؟ » یاخــود «را ... (و) لێیە ؟ » لە جیاتی « ڕات لێیە ؟ » » .

ب)  لە ناوچەی سلێمانــی و هەندێ شوێنــی دی نیشــانەی (دە)ی موزارەعەت دەبێ بە (ئە) وەك : دەڕۆم ــ ئەڕۆم

ج)  دەنگی (د)ی هەندێ وشە کلۆر دەکرێ و لــە بریتی ( منــداڵ ) دەوترێ (مناڵ) .

د)  ئەمڕۆ لە هەندێ شوێنی کوردستاندا ، بەتایبەتی لە ناوچـــەی سلێمانیدا دەنگی (د)ی ژمارەکانی ( یازدە ، دوازدە ... ) سواوە و دەوترێ (یانزە ، دوانزە ... )

... هتــد .

ئەو جۆرە قرتاندن و کلۆرکردنە ، کە تایبەتە بە ناوچەیێك ، نابێ لە زمانی ئەدەبی و نووسیندا ڕەنگ بداتەوە • لەبەر ئەوەی ئەم حاڵەتانە گوڕانێکی شێواون و سەرەڕای ئەوەش ، چونکە نەك هەر لە دیالێکتی ژووروودا ، بەڵکو لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی دیی خوارووشدا هەر ئەسڵەکانیان دەوترێ ، بۆیە ڕاست وایە لە زمانی ئەدەبی و نووسیندا واز لەو جۆرە تایبەتێتی‌یە ناوچەییانە بهێنرێ •

٦ــ لەبەر ئەوەی لە پێکهاتنی کرداری داخوازی و ئیلزامی‌دا نیشانەی (ب) هاریکارە ، بۆیە ڕاست وایە لە نووسیندا ئەم بنچینە و قاڵبە بپارێزرێ واتە پێویستە بنووسرێ ( ڕابکە ، هەڵبگرە ••• ) ، نەك وەك هەندێ لە نووسەران لەسەر بناغەی بەدەمدا هاتن و قووت دانی (ب) دەنووسن (ڕاکە ، هەڵگرە •••) •

٧ــ پێشگر و پاشگر لە زماندا بە تەنیا بایەخیان نییە و بە شێوەیێکی سەربەخۆ کارناکەن ، بەڵکو کە دەچنە سەر وشە دەتوانن دەوری ڕۆنانی وشە ببینن و واتا ببەخشن • بەو پێیە ڕاست نییە بەجیا بنووسرێن •

٨ــ نیشانە ڕێزمانی‌یەکانی زمانی کوردی ، چ لە سەرەتای وشەوە بێن و چ لە کۆتاییەوە ، لەبەر ئەوەی بوونی سەربەخۆیان نییە و دەوری هەرە گرنگیشیان دەربڕینی مانای جۆربەجۆری ڕێزمانی‌یە ، بۆیە وەك دەستوورێکی گشتی ڕاست وایە بە وشەوە بلکێنرێن •

٩ــ وشەی لێکدراو ، کە لە دوو وشەی سادە یان زیاتر ، بێ یاریدە یان بە یاریدەی ئینتەرفیکس (ناوبەند) پێکهاتبێ ، لەبەر ئەوەی لە ئەنجامدا بوونەتە وشەیێکی لێکدراو و واتایێکی نوێیان هێناوەتە کایەوە ، دەبێ بەسەریەکەوە بنووسرێن •

١٠ــ له زمانی کوردیدا ، که دوو مۆرفێمی هاوبێژی (تر) هه‌یه ••• یه‌کێکیان ئاوه‌ڵناوی (تر)ه و ئه‌وی دییان نیشانه‌ی به‌راوردی (تر)ه • جا ئه‌و دوو مۆرفێمه ، که یه‌که‌میان به‌شه ئاخاوتنی سه‌ربه‌خۆیه و دووه‌میان نیشانه‌یه ، ڕاست نییه وه‌ك یه‌ك تەماشا بکرێن و بنووسرێن • (تر)ی ئاوه‌ڵناو ده‌بێ سه‌ربه‌خۆ بنووسرێ و (تر)ی نیشانه پێویسته به وشه‌ی پێش خۆیه‌وه بلکێنرێ ••• هه‌روه‌ها وشه هاوواتاکانی (تر)ی ئاوه‌ڵناو : (دیکه ، دی ، که)ش هه‌ر ده‌بێ وه‌ك ئه‌و سه‌ربه‌خۆ بنووسرێن •

١١ــ (و)ی پێوه‌ندیی کوردی گه‌رچی له‌یه‌ك ده‌نگ پێکهاتووه و له کاتی ته‌له‌فوزکردنیشدا له‌گه‌ڵ وشه‌ی پێش خۆیدا دێت ، به‌ڵام ئه‌مه ئه‌و ڕاستییه ناگۆڕێ ، که ئامرازی پێوه‌ندی به‌شێکه له ده به‌شه ئاخاوتنی کوردی و ئه‌م وشه‌یه ده‌وری سه‌ره‌کی به‌یه‌که‌وه به‌ستنی دوو وشه ، یان دوو ده‌سته‌واژه ، یان دوو ڕسته‌یه ••• که‌واته به جیا نووسینی ڕاسته •

١٢ــ هه‌رچه‌نده پێشبه‌ند (پریپۆزیشن) له ڕیزی وشه‌ی ناته‌واوه ؛ به‌ڵام وه‌ك هه‌ر به‌شێکی وشه‌ی ته‌واو ڕواڵه‌تی سه‌ربه‌خۆی هه‌یه و له زمانی کوردیدا یه‌کێکه له به‌شه چالاکه‌کانی ئاخاوتن • سه‌ره‌ڕای ئه‌وه له ده‌ربڕینیشدا به پێش یان به پاشی وشه‌وه نالکێنرێ ••• جا بۆیه پێویسته پێشبه‌ند به جیا و سه‌ربه‌خۆ بنووسرێ ••• هه‌رچی پاشبه‌ند (پۆستپۆزیشن)ه به پێچه‌وانه‌وه پێویسته به کۆتایی وشه‌وه بلکێنرێ ، چونکه ئه‌مه به‌شێك نییه له ئاخاوتن و بوونی سه‌ربه‌خۆی نییه •

١٣ــ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له ئه‌لفوبێی عه‌ره‌بیدا هه‌ندێ له ده‌نگه‌کان چه‌ند نیگارێکی هه‌یه ــ واته له سه‌ره‌تا و ناوه‌ڕاست و کۆتاییدا به چه‌شنی جیاواز ده‌نووسرێن ، به‌شێك له نووسه‌ران وا به‌باش ده‌زانن له وشه‌ی ناساده‌دا به‌یه‌که‌وه نه‌لکێنرێن ، به‌ڵگه‌شیان بۆ ئه‌مه ئه‌وه‌یه ، که هه‌ر وشه‌یێك پارێزگاریی قه‌واره‌ی خۆی ده‌کا و شێوه‌ی ڕۆنانیان ئاشکرا

دەکا • دەستەییکی دی لە نووسەران بەیەکەوە لکاندنیان پەسەند دەکەن و بەلگەشیان ئاسانیی نووسینە ••• بەلێ هەردوو باوەڕ بنەمایان هەیە ، بەلام من شێوەی بەیەکەوە لکانم بەلاوە باشترە ، ئەویش چونکە ڕێنووسی گشتی ئەرکی ئەوەی لەسەر نییە شێوەی ڕۆنان نیشان بدا • هەروەها ئەو جۆرە نووسینانە بۆ کاری لێکۆلینەوەی زمان باشە • جۆری یەکەم سەرەڕای گرانی و دەست هەلگرتن لە نووسیندا ، هەروەها ناوە ناوە بە ڕێکەوت پارچەکانی یەك وشە دوور لە یەکەوە دەنووسرێن و ئەمەش شیرازەی وشە تێك دەدا • هەرچی جۆری دووەمە ، وێڕای ئاسانی ، هەروەها پێکهاتنی وشە نادەکە پتر دەچەسپێنێ ، بەتایبەتی لە زمانی کوردیدا ، کە وشەی نادە کێشەی زۆرە •

١٤ـ بۆ نووسینی وشەی بێگانە دوو حالەت هەیە :

أـ ئەگەر ئەو وشانە وەك ئەسلەکەیان وەربگیرێن ، ئەوە دەبێ بخرێنە نێو دوو کەوانەوە •

بـ بێتو وەك ئەوەی کورد دەریان دەبڕێ ، بەو ئاوازە بنووسرێن ـ واتە لەم بارەدا کەوانە پێویست ناکا ، چونکە بە پیتی کوردی و ڕێنووسی کوردی تۆمار دەکرێن •

بەندە حالەتی دووەم بە باشتر دەزانم : کورد چۆن وشەی هەر زمانێکی بێگانەی وەرگرتووە ، شێوە و بەرگی کوردی بە بەردا کردووە و خستوویەتی‌یە ژێر باری سروشتی فۆنەتیکی زمانەکەیەوە ، هەر بەو جۆرەش پێویستە لە ڕێنووسدا مامەلەی لەگەل بکرێ ، چونکە ڕێنووس ئاوێنەی واقیعی زمانەکەیە •

# دواوانێــك

# بـــۆ

# رێ نووسی کوردی

رۆوفی ئەحمەد ئالانی

## پێش کەشـــە

ــ بەئەو دایکەی کە بەزمانێکـــی پـــاك زاد خستمیە گڕو گـــاڵ ــ بەئەوانـــەی کـــە لـــــە بێشـــکەی مرۆڤایەتیدا رادەژێنرریـــن و بەکـــردەوەی چـــاك مەلاشـــوویان هەڵدەدرێتەوە ••••••

ئالانـــی

# نیگایەك

بانگاوازێك بڵاوکرایەوە کە لە حوزەیرانی ـ٩٨٠ـ دا ، کۆڕێکـــی فراوان دەبەسترێ بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی ، ئەویش بە سەرپەرشتیی لیژنەیەکی تایبەتی دەستەی کـوردیی کـۆڕی زانیاری .. بەنموونە لە رۆژنامەی هاوکاریشـدا ، ژمـارەی ١٩٨٠/٢/٤، راگەیەندراو سۆزئامێزانە لەم بەندەیدا گوتویانە :

« ئێمە سەری قەدرو رێزلێگرتن بۆ تێکڕای ئەم سەربازە نەناسراوانەی رێگای دانانی رێنووسی کوردی دائەنەوێنین ، یادیان لەسـەر لاپـەڕەی دڵمان بەخاوێنی رائەگرین » .

بەرەبەقی نیگـای بدەینـێ تیژەیەکـە بـۆ تەقینـەوەی پـەرۆش و بەپیرەوەچوون ...

ئەویش دەبێتە جیازییەك لە بوخچەی پیرەدایکی مێژوودا .. ئـەوەی گوڵبەندیشی نەکا ئەوا بەلاپەرەی ئەودڵانەوە هەڵنازنێ ... بگـرە بـە ناخاوێن حەلێبەو بە دریوشەی قەڵەم فەساڵ رووشاوە .

جا ، بۆ ئەوەیکە هەمان داپیرەی مێژووم لێزویر نەبێ ، پارچـــە کۆتەلێکی نیمچە سەربازێکی نەناسراو دەخەمە نێو پریاسکەکەیەوە :

رێزلێنان بە خاوێنیو لە لاپەڕەی دڵاندا ملەماکەی لەو تاریکستانەوەیە ، کەدەلێن ئاوی حەیات لەوێدا هەڵدەقوڵـێ ، مەگەر تەنهـا خدریزینـدە ، بەرێکەوت کەمۆلەیەکی لێتۆش کردبێ !!

چارەنووس وادخوازێ کە دالدەی بەرهەمی ئەو سەربازانە بدرێو بنە شەماڵ وەشێنی دلان .. نەك بە بەزەیی پێداهاتنەوەی رووت نهێنەتارماییان لێداتاشرێو بە سۆزەدەمەی دلان جۆلانەیان پێبکرێ .

× × ×

— لەسەرەتای سالی — ٩٧٦ـدا ، گەشتێکم کرد بە گۆڤارەکانی کوردا ، کێشەو دەمەقالێیەکی لەبن‌نەهاتووی زنجیرە وتارێك لە گیروگازیان نام لەسایەی پاش‌گرو نیشانەیەکی سەربەگۆبەندەوە لەروخساری « ەوە / وە » دا .

دوای بەراوردی رای —٢١— بیست‌ویەك زمانەوان هەوێنی ئاژاوەکەم دۆزیەوەو کار لە کارترازا ، سەرنجم‌دایە ئەو مۆرفێمە ناچێتەژێر ئەو هەشت حاڵەتانەی کە بۆگشت زمانێك دەست نیشان‌کراون . کەدەڵێی ناو ، کارا ، بەرکار ، پریپۆزیشن کاری‌تێپەڕ ، ئاوەڵ‌ناو ... راناو .... هتد لەم زمان‌و لەوزمانداو لە رووی ئەرکەوە هەن‌و بەراوردکێیان پێدەکرێ . بەلام ئەو پاش‌گرە تەلسمێکەو تایبەتە بە نهێنی زمانی‌کوردیەوە بێتو نموونەی سەرتاپای شێوە کردیەکانی لێتاونەدەیت‌و ماکی شیرەزاییت نەبێ زەفەری پێ‌نابەیت .

کۆششی ئەوزمانەوانانەم بە ئەمانەتەوە پاراست‌و ناچار کەوتمە سۆراخ‌و پەل‌هاویشتن‌و خۆی کردە کتێبێکی چوارسەدو دە لاپەرەیی دەست‌نووس .

بەو ئیمانەوە کە ئەرکی سەرەکی‌ی کۆڕ دالدەی ئەم جۆرە توژینەوانەیە، لە رۆژی ٩٧٨/٦/٧ — دا پێش‌کەشم‌کردن . ئەنجامەکەی لەرۆژی ٩٨٠/٢/٦ دا بەم چەشنە بوو :

« نرخێنەرەکەی پێی‌گوتم ئەو کتێبە ( قریوەیەك لە چوار وەرزەی زمانی‌کوردیدا ) بە سفەتی « بحث » وەك « کتێب » بلاوناکرێتەوە ، بڕیارمان‌داوە چەند بەشێکی لە گۆڤارەکەماندا بلاوبکەینەوە . »

بەو حیسابە لەسالی « ٩٨١ » وە دەبێ بۆ ماوەی هەژدە بیست سالێك چاوەچسکەی بەرکولی ئەو قریوە ــ نووزە لێبڕاوەبم !!

هەر ئەوەندە دەلێم :

کە بەشێوە وتار کەلکی بلاوکردنەوەی هەبێ لەو گۆڤارەدا نەدەبوو ــ وەك کتێب ــ ڕێگەی لێبگرن •

لەگەل ڕێزم بۆ ئەو زاتە ( اختصاص ) ی ڕەوانبیژیی لایەتێکــــی عەرەبیە و قالبووی مۆرفۆلۆژیو گەردانی کوردیو ناخیکوردی واتەنــی نیە ، بەتایبەتی لە باسێکی وا سرکو ئالۆزکاودا •

---

ــ دیسان لە ٩ / ٩٧٨ ــ دا ، پێشبینیم کرد کە ڕێنووسی کوردی پێویستی بە پێداچوونەوە هەیەو کێشەبنەرەتیەکانــی هــەر لە گۆڕێــن ، نایشارمەوە یەکێ لە ئەندامانی کارای کۆڕ بەلێنیدامێ کە من بەحســـێکی ئەکادیمی ئامادەبکەمو ئەوانیش موناقەشەی لەسەربکەن •

یان لە گۆڤاری کۆڕدا بلاوبکرێتەوە بۆ باری سەرنج •

کەزانیم کەرەسەی گۆڤاری ( ٩٨٠ ) تەواوبووە ، لەگەل کتێبەکـــەی دیمدا وەرم گرتەوە ، لەگەل ئەوەشدا سوربوون بیهێلنەوە بەلکو لەکۆڕی حوزەیراندا بەدلانی پڕلەجۆش هەلزنیم •

دەربارەی کۆڕو کۆبوونەوە بۆ کاری میکانیکیو زانســتی پتــر لــە سالێك لەمەوبەر و لە بەندێکی ئەم بەحسەمدا ، ڕای تایبەتیم دەربڕیوە •

بمانەوێو نەمانەوێ بابەتی زانستیو زمانەوانی پارەوپوولیان لێنازێتەوە ، بەڵام تاوی بەجێهێنانی ئەرکی نەتەوایەتی کاری خۆی هەر دەکا ؛ لەهەمان دەربازگەوەو بەبێ داوای یارمەتی « کتێبی ـ گوڵگەشتێك بە مێرغوزاری خانای قوبادیدا » بەخشیم بە « کتێبخانەی پەیام » لە سلێمانیو چاپکرا ... ئەوا ئەم بەحسەشم پێ بەخشی ، کە لەرووی خزمەتگوزاریەوە دەیکاتە خوانی بەردەستتان[1] • ئەوەی بەتەمای بەرهەمی بێخەوشە با لە خەیاڵدا بنوێ •

---

(۱) ئەم وتارە درێژەی رەحمەتی کاك رەئووف ئەحمەد ئالانی لە فایلی ئەو بابەتانەدا هەلگیرابوو کە بۆ بلاوکردنەوە هاتوون بۆ کۆڕ . ئێمە نازانین ئاخۆ کاتی خۆی « کتێبخانەی پەیام » لە سلێمانی لە چاپیداوە یا نە . لەبەرئەوەی وەختی خۆی هاتووە بۆ کۆڕو بە بێسوودمان نەزانی ، هەر بەوجۆرەی کە نووسەرەکەی نووسیویە ، بێ هیچ دەسکاریەك لە رێنووسو شێوەی لێكجۆیکردنەوەی وشەکانیدا ، هەندێ هەڵەی یەجگار زەقی لێدەرکەی ، لە چوارچێوەی ئەم باسانەی ( کۆڕی رێنووسی کوردی)دا بلاومانکردەوە .

« دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری »

## [ لەروانگەی زمانەوانیەوە : ]

لەسنووری دەسەلاتدا پێدابچینەوە یان بۆی‌دابخزێین بەچاو ئێرەوە « ئەلفوبێ » عەرەبیەکەیەو رێنووسی[1] کوردی چاوی پێ‌هەڵهێناوەو ساختمانی لێ‌سازداوەو لەهەر دەرفەتێکدا بۆی لوابێ میرات‌و کەلەپووری خۆی پێ‌تۆمارکردوە ... هەرچەندێك تێ‌بکۆشین کە هەموو دەنگ‌و کرکەیەکیان پێ‌شکڵ‌نووس‌بکەین لەسنووری دووپات‌کردنەوەی پیت‌و هەڵڕشتنی لوێچێك خاڵ‌و چوکلەو تەریب بەولاوە مەوداماں نەبووەو نیە .. سەرەڕای ئەوەش ، ئەو پیتانەی کە ئێمە نیازیان پێ‌حاسڵ‌دەکەین ، سەر بە خێڵە ــ زمانە سامیەکانن ، ئەوانیش پشت‌وپەنای وشەکانیان بە دەنگە مەندەکانە (کۆنسونانت) نەك بە بزوێن ، بە لێ‌دانەوەیەکی دی :

« واتای سەرەکی لە وشەداو لە زەینی سامی نەژاددا بەستراوە بە دەنگە متەکانەوە بەلام بزوێنەکان ئەو هێزو پێزەیان نیە ، بە نموونە ــ کتب ــ ئەوەندێکی گەردانی پێ‌بکرێ واتا سەرکیەکەی بەستراوە بە ماددەی ــ ک ، ت ، ب ــ وە ، بەلام لە کوردیدا وانیە ، بگرین قەدی [ نووس ] بە بزوێن دەبێتە ــ نەوس ، نۆس نەواس .. هتد کەهیچ پەیوەندییان بە ماددەی [ نووسین ]ەوە نیە .

---

(1) بۆچی نووسیومە [ رێنووس ] و نەم‌نووسیوە [ رێنووس ] تکای ، ئارام‌گرتن‌دەکەم ؛ تادەکەون بەسەر وشەی‌لێك‌دراودا .

له تەقینەوەی گیانی نەتەوایەتیەوە هەستو پەرۆشی زمانەوانــــانو زماندۆستان پژاو توانای خۆیان تێدا خستەکار • لەم بنیادەدا دەتوانین بەرەو ساڵەکانی بیست گەردن بەرزبکەینەوەو چاومان بە هەندێ کتێبو نامیلکەی رێنووسی کوردی مشتومالّ بکەین ••

ئەم کارەپیرۆزە دادەنرێ بە رچەشکاندنێکـــی فەردیی دوالەدوای یەك • کاری تاکەتاکەش هەرچەندە چاولــێکەری‌و لاسایــی تێــدا زەق‌و نمایانبێ ، خودپەسندی‌و مانگرتن لە بۆچوونو قەراردادەی تایبەتیــدا ــ یەکەم دیاردەیەو پێیەوە دیارە • من ناموێ بێنبگرم لەسەر مێژووی ئـــەو کاروانە •• بەڵام بۆم هەیە کەبڵێم :ــ

١ ــ سروشتو میانەی پیتە عەربیەکان بۆ وێنەگرتنی زمانی کوردی ، ئەمپەڕاوپەڕیان پێناکرێ •

٢ ــ ئەگەر لە جغزی دەسەلآت دەبازببینو خەیاڵ لە شکڵو ئەندازەی پیتی‌دی بکەینەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێم کە ئەگەر پیتە عەربیەکان بەلوێچێك خاڵو چوکڵە دەستەمۆ بکرێن بێجگەی ئەوانیــش دەبــێ لالوێچێکیـــــان ــ پێوەربکرێ ؛ چونکە کوتومت هیچ ــ « ئەلفوبێ » یەك بۆ ئێمـــــە نەزاوەتەوە ، یان بەسەرمۆری بۆمان دانەبەزیون !

٣ ــ بەرهەمەکانی سەر بەرێنووس زوربەیان لەچەنــد بەندێکـــی راگەیاندن ــ اعلانی ــ دەچن‌و بەچەند لاپەڕەیەك ، بگرە هەیشە بەتاقـــە پەڕەیەك رای‌دەگەیەنێ :ــ

« وەها ــ بنووسە ••• دەبێ ئاوا ــ بنووسرێ ••• » •

بەبێ ئاوڕدانەوەی لەوەی‌کە هەر بەندێکی ئەو کورتەبڕیارانە چەنــدان لێ‌وپۆپی دژواریان لێ‌دەبێتەوە •

٤ ــ برێ لەو خاوەن بەرهەمانە تەنها هەستی خزمەتگوزاری پاڵــــی پێوە ناوە کە دەستووری نووسینی کوردی دابنێ ، کە لێشی بپرســـــی بەهەموو ئینسافێکەوە دەڵێ : « من زمانەوان نیم »

ئەگەر بەرنەفەسانە لەسەر ئەو قسەیە برۆم دەبێتە مایەی دڵگــیری ، ئەگینا بە بەر چاوەوەیە کە خاوەن بەرهەمەو دەڵێ : « کورد هێشوە بزوێنی هەیە » هیچ ئاورێك لە یاسای فیزیا ناداتەوە •

یان یەکێکیدی برگەو پیتی لێکدی جیانەکردونەوە لەوەش بەولاوەتر : هەر لە [ ئەلفەوە ] بزوێنی کردوە بە دەنگدارو دەنگداری کردوە بە بزوێن‌و هەمزەی بۆ جیانەکراوەتەوە •

٥ ــ هەندێکیش لە ئەو بەرهەمانە ( بەبێ سەرنجدانی قەبارەو بـــاری گشتی ) لایەنی زانستانەو پەیبردن بە زۆر نهێنیی زمان سلاوی پێداوەتەوەو زەمینێکی بەپیتە • بەلام مەیدانەکە ئەوەندە بەرتەسك نیە کە بەو جــۆرە بەرهەمانە ئەم پەراوپەڕی لێبگیرێ •

لە کارتێکرانی ئەو زنجیرە هەوڵدانەوە ئەم رێنووسەی ئێستا بـــە ئەنجام گەیشت و بەچاو زوربەی کوردی نووسانەوە قالبێکی تەقلیــدیی گرت‌و قۆناغ بەقۆناغ نووسەر تووشی دوودلی‌و شێوەگۆڕکێ بوو •

٦ ــ لە لێکۆڵینەوەی ئەو بەرهەمانەدا سەرەڕای بیرو رای جیــاواز ، لایەنی رێزمانی ئەو پێزەی پــێنەدراوە •• یــان رواڵەتانــە بەراوردیــان تێداکراوە •• وەك بۆمان دەردەکەوێ هەندێ گیروگرفتی رێنووس بـــە دەستوری رێزمان نەبێ چارەسەر ناکرێن ، بەستنەوەی رێنووس تەنهـــا بە شکڵ‌کاریەوە یان پسانەوەی لە هەندێ دەستووری تایبەتی کارەکـــەی سەخت‌گیرکردوە •

٧ ــ تەکاتێکی‌دی لە رێنووسی کوردیدا : دوای دامەزراندنی کۆڕی زانیاری‌ی کورد یان‌بەلێ‌دانەوەی ئێستا دەستەی کوردی لە کۆڕی زانیاری‌ی عیراق دا ، رێنووسی کوردی بەسەرکرایەوەو نیمچە هەرەوەزیانە [ بۆ یەکەم‌جار ] ئەنجومەنی کۆڕ چەند بڕیارێکی دەرکرد ، لە بارەی چەندیەتی‌ی پیتەکان‌و دەست‌نیشان‌کردنی هەندێ گیروگرفت‌و چارەسەرکردنیان ، وەك لە گۆڤاری ژمارەیەکەمی سالی ــ١٩٧٣ــ دا ، تۆمارکراوە ، بۆ باری دڵنیایی تەنها مامۆستا مەسعود محەمەد ، هەندێ بڕیاری لێ‌ختووەتە بەرتیشکی لێکۆڵینەوەیەکی وردەکاریانەوە ، ئەمەش لە دوو وتاریدا دەر دەکەوێ :

أ ــ « رێنووسی کۆڕ » گۆڤاری کۆڕ ژمارە چوارەم ، ل ــ ٢٣٢ ــ •

ب ــ بەکارهێنانی « ی » لە رێزمانی کوردیدا هەمان سەرچاوە ژمارە یەکەم ، لــ ٣٩ــ •

لەو تەکانەدا « ێ ، ۆ » ی کەشیدە بەسەر ، لەباتی جووتە « وو ، یی » بۆ بۆرو ژێری درێژ بەداهێنانێکی تازە دەدرێنە قەڵەم • لەتێو هەموو بڕیارەکاندا تەنها ئەم دیاردەیە ( لەچاپەمەنیەکانی کۆڕدا ) جێگەی لەقنیە •

لەبێجگەی ئەو دیاردەیەدا نووسراوەکانی کۆڕیش ( وەك گشت نووسراوەیەکی‌دی ) لەچەند دێرێك بۆ چەند دێرێك‌و لە لاپەڕەیەکەوە بۆ لاپەڕەیەك پڕە لە شێوەگۆڕکێی ئەم وشەو ئەو وشە لە شکڵ‌نووسدا •

من لێرەدا ئەو وشانە زەق‌ناکەمەوە بۆ سەلماندنی قسەکەم ، سەرنجی یەکەم لاپەڕەو دوەم لاپەڕەی نامیلکەی « رێنووسی کوردی » م دا ، لە چاپ‌کراوەکانی کۆڕ ، نزیکەی دە وشە سەرنجیان‌راکێشام :ــ

١ ــ بڕێکیان بە دوو شێوە دووپاتبوونەوە •

٢ ــ هەندێکیان لەگەڵ بڕیارەکاندا بەراوردنین •

٣ ــ زوربەشیان لە نامیلکەکەدا بە شێوەیەك نووسراونو لە زمانی لێکۆڵینەوەکەی ماموستا مەسعوددا بەشێوەیەکی جیاواز شکڵنووس کراون •

بێتو سەرنجی نووسراوەکانی دەرەوەی کۆڕ بدەین ، بەتەواوی کارلەکارترازاوە ؛ لە قەناعەتی خۆمەوە دەڵێم :ــ

ئەگەر لاپەڕەیەك لەیەك کاتدا بەسەر دە نووسەری کورددا بخوێنرێتەوەو ئەوانیش بێنووسنەوە بڕواناکەم سەرتاپای نووسینەوەی دوانیان کوتومت وەك یەكبێ •

لێرەدا پرسیارێکی ئاسان یەخەمان دەگرێ ، بەڵام لە زۆر لایەنی وەڵامەکەیەوە دەبێ قەڵەم خۆی رانەداو مانبگرێ ••••

ئەمەش پرسیارەکەیە :ــ

« هۆی ئەم گەرداوو کارەساتە چیە ؟!•• »

١ ــ چرووسانی گیانی هاوکاری لەنێوان دەزگا رۆشنبیریو ئەکادیمیەکاندا ؛ بەنموونە ئەوا بۆ هەشت نۆ ساڵ دەچێ کۆڕی زانیاری چەند بڕیارێکی دەرکردو لە چوار چێوەی دیواری خۆی نەچووە دەرەوە ، دەبوو لە سەرەتاوە بەرێوەبەرێتیی خوێندنی کوردی لەگەڵ کۆڕدا یەکانگیربیووناپەو پەیڕەوی دوو ری‌نووس نەکرایە •

٢ ــ سەربەستی نووسەرو لێنەپرسینەوەی ، واتە بۆ نووســیاری کورد دروستە هەرچۆنێك بنووسێ جا ــ بە سەلیقەی خۆی بێ یان بە لاسایی بێ •

٣ ــ خۆنەبەستنەوە بە دەستوورەکانی زمانەوە نووسەر چۆن سەلیقەی پێشکا زیاتر رەمەکیانەو بەزمانی قســە دەنووســێ ، کەمتــر خۆی بــە دەستوورەوە دەبەستێتەوە ، بەنموونە :

دەنووسێ « گەییشت » چونکە هەستدەکا بڕگەی « گەیشت » بەگیری گۆناکرێ ؛ چونکە لە دوای « یــ » دەنگەوە یەکسەر بڕگەی کراوە نیــە ، کە بەدوایدا دەڵێ « گەیشتەماڵ » قورسەدەنگ دەچێتە سەر « ش » لــە « گەیش » دا دوایــی بــە بڕگــەی « تە » دێو پیتــی « یــ » بــە مەندێ دەمێنیتەوە ، ئنجا بە راهاتنی زمان بۆ ئەمیان دەنووسێ گەیش تە مــاڵ = گەیشتەماڵ بۆ یەکەمیش ئەوا نووسیویەتی « گە / ییشت » ئەو دوو وشەیە بە تەرازووی فۆنەتیك بەو چەشنەن بەڵام بۆ باری دابینکردن ماوە نیە بــۆ هەموو دەنگ‌و بڕگەیەکی تایبەتی دەستوورێك قوتبکرێتەوە ، راستیەکەی ئەوەیە بۆ هەردو حاڵەتی وشەکە یــەك « یــ » بۆ دەنووسرێ‌و کورتەژێــر فەرامۆشدەکرێ ، یان لە لایە کەوە دەنووسێ : « چراکە پێکە » بە سواوەیی• لە لایەکی کەشەوە دەنووسێ : « چراکە پێبکە » بەپسانەوەی پێشگــری « پێ » کەچی لە « پێکە » دا بەحوکمی سوانەوە لکاندویەتــی‌و نیشــانەی (ب) داخوازی قرتاندوە ئامرازی « پێ » ی پێوەلکاندوە • لە زمانی قسەدا دروستە بەڵام لە زمانی نووسیندا ماوەی ئەو هەرەمەکاریە نیــە • یــــان نووسەرەکە بەتاوی زمانی قسە دەنووسێ بیوك = بووك ، قوییڵ = قووڵ •••• هتد •

تائێستا که قسه له ڕێزمانی کوردیەوه کراوه ، ڕێزمانەکه خـــۆی کراوه به ئامانج نەك وەك هۆیەك بۆ ئامانج ، واته ڕێزمان بۆ ڕێزمان •• ئەگەرچی زمانه ئەدەبیەکەمان تەکاتێکی چالاکانەی داوه بەلاّم شەقلێکـــی یەکسانی نەگرتوەو ئەوەنده له زمانی قسه دانەبڕاوه •• بەنموونه ئـــەوه زوربەی هەره زۆری زمانەوانه کانمان دەنووسن « تیا » لەباتی « تێـــدا » تەنها دوەمیان ڕاستەو یەکەمیان چ له ڕووی دەنگسازیەوه و چ لـــه ڕووی وشەسازیەوه هەڵەیه •

٤ ــ هەژاریمـــان لـــه ئامێـــرو دەزگـــای چاپەمەنیـــدا : دەبینین لـــه چاپخانەیەکدا پیتو چوکلەکانی ، ڕێنووسی کوردی کەموکووڕن ، هەر بۆ ئەوەی کارسازبێ چەند داشو خاڵێك بوشاییان پێپڕدەکرێتەوه یـــان بەناچڵ دەنووسرێنو لەو سەریشەوه دوورنیه به لاسایی ڕەچاوبکرێـــــنو ببنه خۆره له ڕێنووسەکەماندا •

٥ ــ ڕەدووکەوتنی « ئەلفوبێ » ی هەندەران ، وەك فارسیئامێـــزی ، ئەرمەنیئامێزی ، تورکیئامیزی •••هتد ، ئەمانەش هۆیەکی دیکەن بـــۆ تەرتوتونا کردنی یەکبوونی ڕێنووسی کوردی •

**یەکالای چەند قسەیەکی ڕەبەق :ــ**

**یەکـەم :**

« ڕێنووسی کوردی دەبێ لەسەر پێوداێکبێ وشه چـــۆن لـــه دەم دەردەچێ دەبێ وەهاش بنووسرێ • »

وێنەگرتنی گشـــت دەنـــگو کۆمەڵه دەنـــگو لاره دەنـــگو منگەو دیفتۆنگو کورتەبزوێنو قورسەدەنگ به شکڵو ئەندازەیەکی بێگیروگرفت ــ ئامانجو ئاواتی هەموانه • بەلاّم ئەو ئامانجه ( بەگشتی ) ئەوەندەی لـــه

باوەشی « خۆزگە ...!! » دا گینگلەدەدا ، ناکەوێتە بەر رکێفی واقیعو داینکردنەوە ؛ هەمانەو نیمانە « ٣٥ » شکڵو وێنەپیتە ، ئنجا بۆ چەندان لارە ــ دەنگیو دەنگی قەبەو دەنگیگڕ تاقە چوکلەی « ٧ » مان کردوەتە رەمز ، ئەویش پتر لە چارەکە سەدەیەکە هەر لە دەمەقالیداین : ئایا بۆ جیاکردنەوەی رێی گڕ لە رێی نەرم ، هەمان چوکلە لە سەرەوەی بێ یان لە ژێرەوەی بێ ؟!

هەر لە کێشی ئێمە دایە کە بەوە راهاتوین تەنها چوکلەی وێنە حەوت چوار ئەرکی جیاوازی پێدەبینین . جگەلەوەش کۆڕی زانیاری کورد بۆ ژێرو بۆری تیژ تەنها ئەم کەشیدەی [ ــ ] خستە سەر [ و ، ی ] بزوین ، ئەوا بە بەر چاوەوەیە کە بووەتە چ حەشرێك ! لایەکی رێزمانیشی کەلەلاکردوە ، کە راماڵینی نیشانەی ئێزافەیە لە هەندی حاڵەتدا .

ئنجا وەرە بۆ هەموو منگەو فنگەو گیراویو ئاکسانو دیفتونگو بۆ چەندان واو ... بۆ ئەوەندە کاف بە پێی کرکەیان لەم ناوچە بۆ ئەو ناوچە .. بگر لەم دێ بۆ ئەو دێ ــ نیشانەو چوکلە دابنێین یان چەندان خاڵیان پێوەربکەین . تەنها بۆ پیتی [ و ] بەلایەنی کەمەوە ــ پێویستی بە چوار رەمزی جیاجیا هەیە ..

جا ئەگەر یەکانگیربووین لەسەر بەکارهێنانی دەیان خاڵو چوکلەو دووپاتکردنەوە ئەوا نەزەریانە لەیەکدی نزیكدەبینەوە ، کە دەڵێم نەزەریانە ، چونکە بەکردەوە دۆشدادەمێنین لە پێفێرکردنداو لە قۆناغی سەرەتای خوێندنو نووسیندا .

کار بەوەشەوە ناوەستێ هەندێ لە شارەزایانی زمانی کوردی داوای ئسپرانتۆ دەکەن .. نەك بۆ خوردە دەنگەکانی کوردی .. بگرە دەبێ جیهانی بێ ، بە حیسابی ئەو قسەیەی کە دڵێن : « ئەگەر وشەیەکی بێگانەمان

بەکارهێنا ، دەبێ دەنگەکەی بە چوکلەو نیشانەی کـوردان بپارێزین ، وەك پاراستنی دیفتۆنگی نێوان « ر ، غ » لە وشەیەکی فەرەنسیدا • نیشـــانە بۆ کافی کۆیلەی تورکی ، رەمز بۆ پیتی « ط ، ظ ، ث ، ص ، ض » چونکە فلان شاعیر لە شیعرە کانیدا « سراط » ی بەکارهێناوە ، لە فیســارە دەقـە ئەدەبیدا « ظاهر » بەکارهاتوە ، ئەلبەتە ئەم قسانەم لە ــ ئەلفوبــێ ــ ی لاتینی ، هەندێ زمانەوانی کورددا بەدی کردوەو لە خۆمــەوە قەلەمـــی لێرانادەم و لەمەولاش شتی سەمەرەتریــش سەرهەلدەدا ••• وەك خــوا ئێمەی هەر بۆ ئەوە دروستکردبێ پاسی میراتی خەلکی بکەینو کەچـــی هیمان لەسەر رێیەکی حەوت بەسەر یان حەوتبەژێر هەر لە دەمەقالێداین !!

لەو قسانەمەوە گومانم پێدەبرێ کە بیرتەسکانە بۆ باری مەسەلەکــە هەنگاو دەنێم •

١ ــ وەك وتم هەموو دەنگو دەربڕینێك بەشکلو وێنەی تایەتی لــە وزەی دابینکردندا نیە و زۆر لایەن بەستراون بە دەستووری تایبـــەتیی رێزمانەوە ، وەك لە شوێنی خۆیدا باسیان لێوەدەکەم •

٢ ــ جۆرە رێنووسێکیوا پانوپۆڕ لە وزەی پێفێربوونو پێفێرکردنێکی سەرەتاییدا نیە دیسان ئەو رێنووسەی کە زمانی ئەدەبێ پێ دابیندەکـرێو کاری رۆژانەی پێرادەپەرێ ، بۆ تۆمارکردنی هەموو دەقێکی زمانـــیو نووسینەوەی فەرهەنگستانی کوردی زۆر بەرتەسکە ، لەم بارەیەوە ، ئەمەی خوارەوە بیرورامە :ــ

أ ــ ئەو رێنووسە تەقلیدیەی کە پێی راهاتوین بە کەمە دەستکـــاریو خەملاندنێکەوە بە بەریەوە هەیە کە زمانە ئەدەبیەکەی پێدابینبکرێ و لــە قوناغی سەرەتاوە پێی هۆگربین •

ب ــ بۆ تۆمارکردنی فەرهەنگستانو کەلەپووری هەمەجۆرە ، ئــەوا چەندان خاڵو تەریبو کەشیدەو چوکڵەی هەمەجۆرەمان دەوێو وەك جفرە کلیلەکەیان بە دەست شارەزایانی فۆنەتیكو فەرهەنگستانەوەیە .. دانانــی ئەو رەمزانەش بە خواستی تاکەتاکە نابێ ، پێویــستی بە هــەرمووەزە لـــە شارەزایانو پسپۆڕانی زمان ، ئەویش لەژێر دروشمی : « هەموو شــتێك بە ئەندازەی پێویست نەزیادونەکەم » .

لە سەرووی هەمووشیــانەوە رای گشــتیو دەرفەتو دەسەڵاتـــی داچەسپاندن ــ سەرپشکە . لە ئەو دەربازگەیەوە نەك « ێ » کەشیدەبەسەرو « ڒ » ی حەوت بەسەر بەڵکو کافی ســێ شاخیش دادەسەپێ و بــاش‌بــاش مەردومگەلەکە خۆیانیانی پێ‌رامدەکەن .

دووەم :ــ

**« هانابردنە بەر کۆنگرە .... »**

بۆ رێکەوتن لەسەر هێڵەسەرکیەکانی رێنووسو بەربەستی ئاژاوەکە ، هەندێ زماندۆستمان « لە نیازێکی پاکەوە » بانگاوازی بەستنی کۆنگــرە دەکا .. دیارە ئەوانیش ئازار بە ئێسقانیان گەیشتوەو تەنها ئەولایەنە ماوە ــ مەسەلەکەی تێدا تاقی‌بکرێتەوە .

ئەم لایەنەش بە سەڵتی زۆر لکی لێ‌دەبێتەوە :

١ ــ بەستنەوەی باری زانست بە دەنگدانی ژمارەی کورسیو لـــە هۆڵێکداو بۆ ماوەی یەك دوو رۆژ و چەند سەعاتێكو لــە هەرێمێکـــی کوردستاندا ، ئەوەندی‌کە مەسەلەکە دژوار دەکاو فتوای سەرپێیو عەفەوی خۆی تێ‌دەچرێنی . ئەگەر بشمانەوێ تەرازووی رەزامەندی لەنگەربگرێ ،

دەبێ بادەینەوە بۆ دانانی ئسپڕاتتۆکە ، ئەویش ( وەك وتم ) تەنها بـــــۆ تۆمارکردنی فەرهەنگستان دەستدەدا

٢ ـ ئەگەر کۆنگرەش تەنهـا بۆ ئەوە بێ و لیژنەیەك لـه پسـپۆڕان تەرخانبکاو بکەونە خۆیان ، لەوەلاّمدا دەڵێم :ـ

أ ـ ئەو هەنگاوە بۆ کارێکی تازەیە ، کە لەسەرەتای پەیدابوونداب‌ێ •

ب ـ کاتێك پێویستمان بە کۆنگرە دەبوو کـــە شارەزایانی بـــۆ تەرخانبکا کە ئەم مەڵبەندانە نەبوونایە :ـ کـۆڕی زانیـاریی کـورد ، بەڕێوبەرێتیی خوێندنی کـوردی ، یەکێتیی نووسـەرانو دەزگـــا ـ ڕۆشنبیریەکانیدی ••• هتد •

ج ـ ئەگەر کۆنگرەش تەنها بۆ رایەلخســتنی ئـەو لایەنانە بـێ « کە تا ئێستا لە یەکدی بەرکەنارن » ئەمەیان بە کارێکی پێویست دەزانمو بۆ ئەم یەکخستنەش بەرەورووی ئەنجومەنی یاسادانان دەبمەوە •

سـێیەم :ـ

**« تا دەتوانرێ وشەی لەیەکدراو بەسەر یەکەوە بنووسرێ ؛**
**بۆ ئەوەیکە نووسینەکەمان سفتبێ » •**

ئەگەر مەسەلەکە نەزەریانەبێ •• خۆزگەو پەرۆشـــی خۆمی دەخەمەپاڵ کە نووسینمان پچڕپچڕ نەبێ •

وەك لە لێکۆڵینەوەو بەرەنجامیی خۆمەوە بۆم دەرکەوتوە نووسینی وشەی لێکدراو بەهەمەچیـزە گیروگرفتێکـی سـەختیان ـ خستوتـە ڕێنووسەکەمانەوە ، ئەو قسەیە « پێکەوەنووسینی وشەی لێکدراو » لـە

ڕێنووسی فارسیدا تارادده‌یه‌ك ته‌كانی پێ‌ده‌درێ ، چونكه ڕێنووسه‌كه‌یان میراتیه‌كی نه‌كامڵه‌و به‌زۆرملی سواری بوون‌و به‌ چه‌شنی عه‌ره‌بی بزوێنه‌كان به‌پێت تێكه‌ڵ‌كێش ناكه‌ن‌و باری‌دابین‌كردنیان داوه‌ته‌ ده‌ست سه‌لیقه‌و ڕاهاتن به‌بیسته‌نی‌و حاڵ‌ومه‌قام‌و كه‌ زۆریشیان تێ‌گیرا هانا ده‌به‌نه‌ به‌ر « فتحـــــه‌و ضمه‌ » ی له‌ مه‌ڕ عه‌ره‌بان هه‌رچۆنێ‌بێ ڕێنووسه‌كه‌یان فۆنه‌تیكیانه‌ نیـــه‌ ، مه‌رجیش نیه‌ ئه‌و ته‌گه‌رانه‌ی كه‌ ئه‌وان « به‌هه‌ر بیانوویه‌ك‌بێ » ئاوڕی لـــێ ناده‌نه‌وه‌ یان بۆیان ده‌ست‌كاری نه‌كرێ ئێمه‌ش خۆمانــی پیوه‌ببه‌ستینه‌وه‌ ، تێ‌بردنی ده‌سته‌واژه‌ی [ تا ده‌توانرێ ] ڕاسته‌ورەوان ئه‌وه‌ی داوه‌ به‌ده‌سته‌وه‌ كه‌ لكان‌و نه‌لكان بدرێته‌ ده‌ست زه‌وق‌و سه‌لیقه‌ی نووسه‌ر نه‌ك بخرێتـــــه‌ ژێر ركێفی ده‌ستووری گشتیه‌وه‌ .

تائێستا له‌ هیچ‌گوڤارو كتێبێكی كوردیدا تاكه‌ په‌ره‌یه‌ك ناكه‌وێتـــــه‌ به‌رچاو كه‌ دوسێ وشه‌ی لێك‌دراویان تاسه‌ر تێدا به‌ لێك‌دراوی نووســـرابن‌و به‌چه‌ندبار نه‌گۆڕابن !!

ئه‌مه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ چه‌ند هۆیه‌ك :

١ــ تا ئێستا له‌ به‌رهه‌مه‌ ڕێزمانیه‌كاندا نه‌گه‌یشتوینه‌ته‌ ئه‌نجامێك كـــه‌ جۆره‌كانی وشه‌ی لێك‌دراو و دۆخی پێك‌هاتنیان ده‌ست‌نیشان بكرێن ..

٢ــ تائێستاش پێش‌گرو پاش‌گرو پریپوزیشن‌و نیشانه‌و ئامراز له‌یه‌ك‌دی هه‌ڵنه‌هاوێژراون ، به‌نموونه‌ له‌ فقه‌اللغـــه‌دا خـــاوه‌ن به‌رهه‌مـــه‌و ده‌ڵـــێ : « ئه‌وه‌شی » وه‌ك « ئه‌وه‌شی كرِی » پێش‌به‌نده‌ = پیش‌گر . هێناویه‌تـــی : ڕاناوێكی ئیشاری‌و (ش) ی ئامرازی به‌ستنه‌وه‌و «ی» ڕاناوی كه‌ســـــی سێیه‌می تاك ، هه‌مووی به‌ یه‌ك پێش‌گر داناوه‌ .. كه‌وابێ هه‌موویان بـــه‌ چاوی یه‌ك وشه‌ی لێك‌دراو سه‌یرده‌كرێن ، ئه‌و بۆچوونه‌ هه‌ڵه‌یه‌ هیـــــچ جیاوازیه‌كی نیه‌ له‌گه‌ڵ ده‌سته‌واژه‌ی « ئه‌وه‌ش من‌و تۆ » به‌و حیســـــابه‌ ده‌بێ دروست‌بێ كه‌ بنووسرێ « ئه‌وه‌شمنوتۆ »

یان خاوەن بەرهەمی « رێ نووس » ەو دەڵێ : « دووپیتی بزوێنـــی ( و ، ا ) یان ( و ، ە ، و ، ی ••• ) هتد ، وەك لە : « زاوا ، کـــاوە ، جەوی ـــ دا » هەموو کەس دەزانێ کە پیتی / و / لەو وشـــانەدا دەنگـــدارە •• ئەگەر موعادەلەی « بزوێن + بزوێن » یان بەولاوەتریش « هێشوە بزوێن » بەلای هەندێ فۆنەتیك زانەوە دروستبێ یاسای فیـــزیا هەڵدەوەشـــێتەوەو دەبێ دروستیش‌بێ کە دووفرۆکەی تەکاندەر یەکیان بۆ ئاسمان‌و ئەوی‌کەشیان بەرەو ناخی دەریا دەربچن و ئەگەر هەوادەزوویەك بە پاشی هەردووکیانەوە شەتەك‌درابێ لە کاتی رویشتنی پێچەوانەیاندا هەوداکەنەپسێ !!

لەوەش بەئاگام ئەو حیسابەی‌کە بۆ لێك‌دراو دەکرێ لە مۆرفۆلۆژیدا هەمان پێوانە نیە بەسەرجەمی لە رێ‌نووسدا •

هەرچەندە رێ‌نووسی کۆرِ بە نیگایەکەوە هەندێ وشـــەی لێـــك‌دراو بەسەردەکاتەوە کە بەیەکەوەبنووسرێن ، بەڵام بەکردەوە نەی‌توانیوە بریارەکە بەئەنجام بگەیەنێ بەڵام لەوەدا کە کۆرِ هەنگاوی ناوە دوپیتـــی ( ی ، ێ ) بگێرِێتەوە بۆ سروشتی خۆیان‌و لە کوتایی وشەدا پیتەلکاوبـــن‌و لای‌داوە لە رێ‌نووسی کۆن زمانەکە بەرەو سفتی دەباتەوەو لەچەندان برِگەی ناساز رزگارمان دەکا ، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا :

| رێ‌نووسی تازە | رێ‌نووسی کۆن |
|---|---|
| پێـــی | پێ‌ی |
| کوردیە یان ـــ کوردییە | کوردی‌یە |
| نیە یان ـــ نییە | نی‌یە |
| پێیەوە | پێ‌یەوە |
| زانییان | زانی‌یان |

له هەندێ قسەی رەبەقدا سەر بەهەر لایەتێك بن ئەفسانەی جامــی جەمم دێتەوەیاد ، کە دەڵێن :ــ « لە پارچە ئاوێنەیەکی ئــەو ســەردەمــەدا هەموو دنیای تێدا بینراوە » لەلایەکەوە دەمانەوێ کــە هەموو دەنــگو خێڵە وشەیەك لە رێنووسەکەماندا بە شەقڵو نیشانەی تایبەتی پیشانبدرێن ... لە لکانی وشەدا خۆمان لە بزربزری قوتاربکەین لەولایشــەوە لــە سنووری چەند پیتێكو تاقە چوکڵەی وێنە ــ٧ــ نەچینە دەرەوە .. بەبــێ خۆ ماندووکردن بە رێزمانەوە نووسینمان وەك ئاوی رەوان بە ئەنجامبگا !!

من لافی ئەوە لێنادەم کە دەبێ هەموو نووسەرێك زمانەوان بــێ .. هیچ نەبێ ئەوەندەی بۆ فێرە نووسینی زمانی دەرەکی پابەندی چەنــدان دەستوورەو لەگەڵیاندا مەلەکەی بۆ پەیدادەبێ .. نیو ئەوەندەش خــۆی لەگەڵ چەند دەستوورێکی رێزمانی کوردی خەریكبکاو پێیان رامبێ .. ئەگینا لە رێگەی لاساییەوە ئەوگشتە تەلیسمە زمانیانە وەك رشتەی مرواری ناهۆنرێنەوە .

چــوارەم :

« لەسەرەتاوە بە ڕابەریی مامۆستا فێری ئیملا دەبین ... »

باشترین هۆی چەسپاندنی رێنووس لەیــادی نووســەرداو هــەر لەتەمەنی هەراشیەوە مامۆستایە .. ئەوەش باوە کە بۆ چۆنێتیی وتنــەوەی کوردی رابەرێك دەستنیشان دەکرێو چەند لایەنێکی گشتیی بــێ تەرەفانەی تێدا رەچاودەکرێ . ئەوەنــدەی مامۆســتاکە لــە دەســتوورە رێزمانیەکانی دەرەکیدا شارەزایە لە کوردیەکەدا بێئاگایــە .. تەنهــا بەلاساییی شکڵنووسی کتێبەکان قوتابیان فێرە نووسینەوەدەکرێن .. هەر ئەوەندە ــ مامۆستاکە بزانێ بەکوردی قسەبکاو ڕێگەی وتنەوەی بڕگەییو حینجە بزانێ ، ئەو ئەمانەتەی پێدەسپێردرێ . ئیدی بیرلەوە نەکراوەتەوە کە

رابەرێك بۆ ئیملا (وەك بەشەتەواوکەرێکی رێزمان ) دابنرێ‌و هەر لەسەرەتاوە ئاشنایەتی لەتەکدا ببەسترێ‌و تەنها خوو نەدرێتە رەمەکی‌نووسینی کتێبەکان کە لیژنە بەلیژنە بەخواستی خۆیان شکڵ‌نووسیان‌کردون‌و بەدرێژایی‌ی ساڵ چ مامۆستا و چ قوتابی بە لەقی‌و دوودڵی دەکەونە وێزەی کوردی‌ی نووسین •

ئەوەش ناڵێم کە قوتابیان راستەوخۆ بەدەستوری سەربەخۆیانەی رێ‌نووس ـ سەرکوێر بکرێن •• بەڵام مەرجە بۆ مامۆستا کە بست‌بەبست لە دەستورەکان بەئاگابێ

وەك تاقی‌کردنەوەیەك حەوت هەشت ساڵێك دەبێ زۆر لە مامۆستایانی بەپەرۆش راوێژ بەئێمەمانان دەکەن کە چۆن •• واوو یێ‌ی بزوێن « و ، ی » لە جۆری دەنگدار جیادەکرێنەوە ، واتە چۆن بزانین کە / و / یان / ی / بزوێنن یان دەنگدارن ؟

من دان بەخۆمدا دەگرم‌و لەشوێنی خۆیدا ئەم گرێیە خاودەبێتەوە •

پێنجەم :ـ

« ئەگەرنووسینمان بەلاتینی بێ هیچ گیروگرفتێکمان نایەتەرێ و هەموو‌شتێکی پێ بەرکەماڵە •• »

ئەمەش یەکێکە لە قسە رەبەقەکان ، لە بنەڕەتدا پیتە لاتینیەکان بەتایبەتی بۆ کوردان دانەبەزیون •• لەگەڵ ئەوەشدا سەرپێچی لەوە ناکرێ کە لەبارترو سفتترو گشتی‌ترن •• هیچ نەبێ تەگەرەی بزربزریمان لەکۆڵ دەخەنەوە ، ئەوەندەش قەڵەم هەراسان نابێ بە دەست نوختەو خاڵ‌داکوتانەوە بێجگە لەوەش لەگەڵ براکوردەکانی دی پێیان لەیەکدی نزیك دەبینەوە ، زۆر وشەی جیهانی‌و دەرەکیش هەن پێی بەراورددەکرێ‌و گەرێدەکانیش

ئەمانەتی زمانەکەمانی پێدەپارێزن و زووبەزوو پێیی فێردەبن • ئەوەندێکی لەدەستەڵاتدابێ پێویستە نووسەرو رۆشنبیری کورد بەو رێنووسەش چەشەبێ • بەڵام دەبێ بەچاوی میسالی سەیری ئەلفوبێ لاتینیەکە نەکەین ، ئەو ئاژاوەیکە لە رێنووسە باوەکەی ئێرەماندا هەیە ، تا رادەیەکی باش لەوێشدا خولقاوە :

بەنموونە : ١ــ زانای کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی ، لاتینیەکەی ئینگلیزی ئامێزە جووتەپیتی بۆ یەك کۆنسونانت سازداوە •

٢ــ میجەرسۆنو رۆژهەڵاتناسەکانیدی رێنووسی ولاتەکەی خۆیان کردوەتە بنکەو بەئارەزووی خۆیان بۆ مەرامی خۆیان چوکڵەو دەبڵپیت نیشانەی تایبەتیی وەختییان داتاشیون •

٣ــ دوکتۆر کەمال فوئاد بۆ هەندێ پیتی تایبەتیی عەرەبی وەك : ص ، ض ، ط ، ظ ••• » چوکڵەی تایبەتی خستونەتەسەر ، سەرباقی ئەو هەموو نیشانەو رەمزانەی کە لە لاتینیە تورکییەکەوە دابەزیون•

٤ ــ پوختەترینیان (وەك مامۆستا نەبەز دەڵێ ) ئەلفوبێ لاتینیەکەی زانای خوالێخۆشبوو ( جەلادەت بەدرخان ) ە ، کە نزیکەی ــ١٣ــ ساڵ پێیەوە خەریكبووەو •• تائێستا پەنجا ساڵێکە براکوردەکانی تورکیاو سووریا پێیی دەنووسن • بە کەمە دەستکاریەکەوە بۆ هەموو لایەك دەست دەدەن •

٥ــ مامۆستا نەبەزیش لە نامیلکەکەیدا « نووسینی کوردی بەلاتینی ، چاپی بەغدا ــ ١٩٥٧ــ » لایەنگری ئەو رێنووسەیە •

وەك وتم گەرداوەکە لەویشدا نەنیشتوەتەوە ئەوەتانێ کوردەکانی یەریڤانو ئەرمنستان لاتینیی رووسییان خستەوەگەڕ •

ئاوردانەوەیەکی تایبەتی :

مەسەلەی خاڵو چوکلە لە لاتینیە تەقلیدیەکەشدا خەستکراوەتــەوە :
وەك :

ê — i — I I — v — Q — Ç — ş — x̄ — h — ö — A

یان دانانی نیشانە پیتێك ، لەلایەکەوە رەمــزی بڕگــە = دەنــگ + بزوێن ــ بێ و لە لایەکی دیکەشەوە رەمزی بزوێن‌بێ ، وەك لە وشــــەی « ARAM » دا بەدی دەکرێ ؛ لەسەرەتاوە [ A ] بریتیە لە بڕگەی ــ ئـ + ا = ئا • لە ناوەڕاستەوە بریتیە لە تاقەبزوێنی ــاــ ، هەر وەهــا لە وشــەی ــ e' N = نەء ــ دا ، کە لەباتی دەنگی هەمزەی وێســتاو « ءْ » کۆمای بۆ فرێ دراوە !•• یان بۆ دیفتۆنگ لاتینیەکەش بــە ئاڵوزی ماوەتەوە لە نێوان wè و ö دا • راستیەکەو نای‌شێرمــەوە مەسەلەی (ء) و (ا) ئەویان دەنگەو ئەمیان بزوێن کورد چارەسەرێکی بنەبڕی بۆ دۆزیوەتەوە کەچی عەرەبەکان لەو شێوە پیتانەدا کە زادەی خۆیانــن تائێستا ئەو زەفەرەیان پێ‌نەبردون وەك لە کوردیدا بە رەوانی دەنووسرێ : « ئارام ، ئینجا ، ئەو ، ئومید ، ئۆخەی •• » پیرەهەمزە لەگەڵ بزوێنــــدا لەسەر کورسیی تایبەتی رۆنیشتوە • بەلام لە رێ‌نووسی لاتینی ••• بگرە لە عەرەبییشدا •• تابلێی ئاڵۆزو سەربەگێچەڵە !!

سەرەرای هەموو تەگەرەو کۆسپێك گرنگ ئەوەیەکە لەسەر یەك‌شێوە پیتك‌بێین کەتائێستا ئەو خاسیەتەمان تێدا نەبووە : چونکە دەرفەتمان لـــە چارە نەنووسراوە •

شـەشـەم :ـ

## « ئەگە رێنووسی کوردی بەراورد بکەین لەگەڵ رێنووسەکانی دەوروپشتیدا ، فۆنەنیکیەو لەبارترە »

بەچاوپۆشین لە هەندێ رای جیاواز جیاوازو برێ گیروگرفت قسەیەکی نوقلآنە بەخێرەو دەسەلمێنرێ •

بەلآم نابێ ببێتە مایەی لەخۆبایی بوون ؛ چونکە :

١ـ ئێمە لە سەدەی بیستەمدا بنیادی ساختمان دەنین بـۆ زمـان کە ئەندازیاریەکەی فرەجیاوازە لەگەڵ بنیادی دەوارنشینیدا •

٢ـ ئەگەر فەرزی ئەوە بکەین کە زمانەوانانی گەلە سـەرکەوتوەکـان زیندوببنەوە و لە نووکەوە تێهەڵبچنەوە ، گومان لەوەدا نیە کـە گشـتیان کردە پەشیمانن‌و لە دەرفەتێکی کەمدا ، ساختمانێك رەنگ‌رێژدەکەن ، کـە رووومان نەیە سەیریشی‌بکەین •

٣ـ میراتێکی ئەوەندە زەبەندیان پێ کەڵەکەکردوە ، بێتو دەستکاریەکی سەرجەمی بکەن بۆ ماوەی نیوە سەدەیەك لە کیسیان دەچێ‌و بەرەی نـوێ ناتوانێ بیانخوێنێتەوە کۆن‌و نوێ لە یەکدی دەپسێنەوە •• خـۆ ، لـــە چاپدانەوەی ئەوسامانە عەمبارکراوانە کارێکەو لە وزەبەدەرە !!

٤ـ نەریتی نەتەوایەتی‌و خۆدارنین لە تەقلید :ـــ

هەموو نەتەوەیەك شانازی بە راگرو جیاکەرەوەی خۆی دەکـاو زۆر زەحمەتە واز لە میراتیی خۆی بهێنی ،•• خۆدارنین لە تەقلید ئەویـــــش کارێکی ئەوەندە ئاسان نیەو رەوتێکی مێژوویی‌و گارۆیی دەوێ لەگــــەڵ دەسەلآتیکی شۆرش گێرانەی بەزەبردا •• لەم بارانەوە لایەنی سایکۆلۆژی‌و

نەفسی شیکردنەیەوەکی بەرنەفەسیان دموێو ماوەی لەسەر رۆیشتنم نیە..
ئەوەندەی ئێستا هەست دەکەین بە زەحمەتی خاڵدانان ، دیارە کاتی خۆی ئەوەندە بیری لێنەکراوەتەوە .. دەقمان بەزۆریی خاڵدانانەوە گرتــــوەو کەمتر بیرلەوەدەکرێتەوە بۆ چی پیتی « چ » کەلە « ج » وەرگیراوە بە سێ خاڵ جیاکراوەتەوەو بە دووخاڵ جیانەکراوەتەوە ؟.. هەروەها پیتی « ژ » لە « ز » بە دوو خاڵجیادەبوەوە ، وەك پیتی « ذ » لە « د » بە تاقەخاڵێــك ...
ئەم لایەنە ــ تەقلیدییانە وا تێکەلی بارەدەروونیەکە بوون بێتو پێش‌نیازبکەم کە پیتی « چـ ، ژ » بە دوو خاڵ جیابکرێنەوە نەك بە سێ خاڵ ... دوورنیە بە کابرایەکی شێتو بەلەسە رەدووم‌نەکەون ؟!

بەڵام زۆر لایەن کەبەلەقی لە گۆڕێدانو دەستکاریان کەلەبــــــەر پەیداناکا لەوێوە دەتوانین هەنگاوی یەكلایی بنێین .

ــ تائێرە قەڵەمم لەچەند خاڵێکی گشتیەوە ژەنــی .. ئنجــا بــۆ وروژاندنی چەند هەڵوێستێكو بەرەو نیشان کرد ←

١ــ بە پێویستی نازانم کە بە کتێبو نامیلکەی رێنووسی کوردیدا بچمەوە ، کە هەندێکیان پیتی « لا ، ڵا ، لــلا للاَ ، ڵل ، وێ ، نــــگ ... هتـــــد » سازیان‌داون ، یان هەمزەو ئەلفیان بۆ جیا نەکراوەتەوە ..

لەبەر ئەوەیکە رێنووسی کۆڕی زانیاریی کورد کاری لیژنەیــەو پتر جێی متمانەیە لەویوە دەستپێدەکــەم . دیــارە بە خواســتی شــوێن جاربەجارێ سەرچاوەی دیش دێنەگــۆڕێو بەراوردەکەم کــۆنو نــوێ دەگرێتەوە .

لەو رێنووســەدا ــ ٣٥ ــ سیوپێــنج پیت بەدەنگــدارو بزوێنــەوە بڕیاردراوە ، لە دووسەرەوە ( باشی و ناباشی ) باریسەرنجم‌هەیە ، لێــرەدا

هەمووشتێ بــە تەسەلی یەکالآ ناکرێتــەوە رێبەخـــۆم دەدەم کــە بــە کورتی بڵێم :ـ

* ١ ـ هەر لە نووکەوە بەرانبەر بە وشەی «حرف» ئایا «تیب» بێ یــان « پیت » بێ دووبەرەکیانەو بەردەوام دەستەویەخەینو لافی یەکبوونـــی رێنووسیش لێدەدەین •

بەر لەوەی‌کە لەو جووتە وشەیە بکۆڵمەوە پێش‌وازی لە بڕیاری کۆڕ دەکەم کە « حرف » ی بە « پیت » نەك « تیپ » ناودێرکرد •

هەرچەندە زەق‌کردنەوەی دووبەرەکیەکە کوتانەوەی دەمەقالێــەکــی نەپساوەیەو هەردوولا بیانوویان بەدەستەوەیە •• بەڵام پێویستی بــــە بەراوردێکی خەستتر هەیە ، ئەوەندێکی لێ‌بڵێین لە « فقه اللغه » ی کوردیدا هەزارو دوورەپەرێزین ئەوەندەی باری نەفسیمان بەلاساییەوە هۆگر بووە ئەوەندەش لە خۆمان خانەبێزارین ••• لە ئەشکەوت‌نشینیەوە دانەیەکـــی دەنگی دانەبەزیوە کە ناو بێ بۆ ئەو کەرەسەزمانیەی بە عەرەبی پێی دەڵێن « حرف » و بە ئینگلیزی پێی دەڵێن « تایپ » یان بە کوردی جارێ نازانــم چۆنی ناوبنێین !؟

هەرکامێکیان بگرین زادەی هونەرە ـ بەیانیەکانو سەربەخوازەکارینو کیشەی ناوێ • چۆنی لێوردبینەوە بەنموونە « حــرف » ی عەرەبی لــە سورِگەی، واتای گۆشەو کەنارو کەمیو زەدەی سەر زوبانەوەیەو بۆ ئــەم زاراوە نوییە ، خوازراوە •

لە کوردیدا دوو وشەی بەرایی « بدائی » لە قاوغی واتای ســەرکیدا خولقــاون :ـ

**١ ـ تيپ :**

وشەیەکی ئێرانیەو ملکی کوردانیشە ، بە واتای لەشکرو دەستە لەکاردایەو بەخوازەکاری ویردی شاعیرە کلاسیکیەکانە ، کە بۆ تاتای زوڵفی یاران بەکاری دەهێنن ، لەو کاتەدا کە چینی زوڵفان دەشوبهێنن بە هێرشی سوپا • بۆ مەبەستی هێرشی ئاگریجە وەك لەم شیعرەدا

« کۆرپە هەیوەچان نە هەیجای هوجووم »

« خەجەڵدان وەباڵ بەیداخانرووم[1] »

لە واتای دەستە دەشتەدا وەك لە ئەم شیعرەی خانای قوبادیدا :

« چون سوپای سەنگین ساروچەی خونکار »

« مدرابی چەند « تیپ » نەسەراو کۆسار »

یان لە ئەم شیعرەی مەلای جەباریدا بە واتای پۆل پۆل :ـ

« تیپ ، تیپ قولنگان قەتارەی قازان

میرزام تاوەرۆژ ئاوات مەوازان » •

ئنجا بابزانین داخۆ بە خوازەکاری لە کوردیدا بەرانبەر بە « حرف »ی عەرەبی دەگونجێ ؟ هەردانە دەنگییەك لە پێكهێنانی وشەدا ، بشوبهێنرێ بە قەتارەو دەستە ، پەیوەندی ویچوونەکەش تەنها بریتییە لە ریزبوونو کەڵەکەبوون • بەڵام لە ویچوونی « زوڵفان تیپ تیپ وەستان » دا سەرنجی لایەنی هێرش دەدرێ و بەهێزترە • هەرچۆنێبێ لە ریزبوونی خوردە دەنگەکانی وشەدا رێ لە خوازەکاری ناگیرێ •• بەڵام لە هۆشی مندا ویچوونەکە دوورەمەبەستەو واتا بنجیبەکە لە زەین ناترازێنێ •

---

(١) بۆ شریتی خاڵەحمەعەلی خوالێخۆشبوو لە ئەرشیڤی کۆری زانیاریدا / کۆکردنەوەی ئالانی .

ئەوانەی گە [ تیپ ] یان کردوەتە مارکەی نووسینەکانیان لـــەو دەربازگەیەوە بیانوویانم نەکەوتوەتەبەرچاو ، بگرە بەم حیسابانەی خوارەوە پشت ئەستوورن :ـ

١ـ تیپ و پیت ـ جیاوازیان نیەو پاشوپێشیان پێ‌کراوە ، وەك لـــە « تەرزە ، تەزرە » دا ، بەپێی ناوچەیەو هەردوکیان یەکێکن •

ئەم بەڵگەیە هەڵدەوەشێتەوە ؛ چونکە بەچـاوی ـ تەرزە ، تـەزرە ـ سەیرناکرێن‌و کورد بۆ واتای بەرایی‌و جیاواز پیت‌و تیپی هەیەو هیچیان لـە هیچیان ناکەون‌و فەرزی پاشوپێشی دەنگیان تیداناکرێ • بێجگە لەوەش کە « تیپ » هەڵگەڕاوەی « پیت » بێ ، بۆچی ددان بە « پیت »دا نانێ ؟!

٢ـ دەبێ بوترێ « تیپ » نەك « پیت » بەدەڵدەی ئەم هاوکێشـــە « معادلة » یەی خوارەوە : « پیت = پیوت = Pöt

= پووت = پووچ = ⟵ ئەنجام : پیت = پووچ » •

تومەز لەزاری ئەو زمانەوانەدا ، وشەی پیت‌و پووچ کە بە بزوێنـی ( ی ) و (وو ) ی تیژن بە دیفتۆنگی ( W ê ) یـــان ( ـ ö ـ ) دەریان دەبڕێ •• بە یەکیان دەزانێ ، واتە : پیت = پووت •• دیارە بـەو حیسابە : پیت = حرف هەڵەیە •

٣ـ بڕیکی‌دی بە شانازییەکەوە ، وشەی « تیپ » دەقۆزنەوە ، چونکە لە تایپی ئەورووپاوە نزیکە ، ئەمەش لاساییەکی رووتەو هیچ پێویست‌نیـە کە بەپاشەڵی ـ تایپ » ەوە خۆمان هەڵە ڕۆسـکێنین‌و میراتـی‌ی خۆمـان بچرووسینین •

۲ ــ پیــت :ــ

ئەم وشەیە لە واتای بنجیو خوازەدا کوردانەو ڕەسەنە ، ئەگەرچــی بەرەی ئەم وشەیە لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆیان نەداوە بە دەستەوە کــــە بیانووبڕبێ پتر هانایان بەو قسەیەیە کە دڵێن :

«پیتولەتێکی خوێندوە یان ــ نەخوێندوە» بەشبەخۆم پشت بەئەوەندە قسەیە نابەســتم ؛ وەك دێرینەیــەك لــە هــۆشو گوشمداناچەسپــێ •• لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژیانەی دەوی و ئنجا بخرێتە بەرتیشکی هونــەری بەیانەوە

۱ــ دەبێژرێ : « پرِوپیتاکی تێــو مــاڵ » واتە :ــ پــەڕۆو شــرِەو خوردەبابەتی تێوماڵ •

۲ــ «پیتو بەرەکەت » واتە : بەپێزو بەبرِشتە •• بەداهاتە ••

۳ــ « پیتاككردن » واتە : کۆکردنەوەی لەم کەمێكو لەو چکێك ، جا بەخوایشت بێ یان بەزۆربێ ، وەك پیتاككردن لەلایەن مســکێنەوە بــۆ ئاغاو گزیر •

---

* ماموستا عەلادین سجادی ( لە نێو باسێکیدا ) دەڵێ : « پیتــاك » لــە کۆندا بە مەعنای ئاشکرابوون بووە ، زەمان مەعناکەی گۆڕیوە بـــــۆ « باربــوو » •
تێبینــی :

اــ ناتوانم کە بڵێم بە واتای ( پەیدابوون ) نەبووە .

بــ وای داوە بەدەستەوە کە لە بنجدا تێکڕای ( پیتاك ) بێ . بــــەلام بە پێی بەراورد بنجەکەی هەر (پیت) ەو پاشکری « اك » ی لــــــێ زێدەکراوە ، وەك وشـەی « خۆراك » کە لە « خواردن + اك » پەیدابووە وشـەی « خۆراك » یش کەمکەم دەگەیەنێ ، هەر لەبەر ئەوەشــە کــە بــە عەیارەی باروتی ساچمەزەن دەوترێ « خۆراك » .

٤ــ « بەلەپیتکە هاویشتن » پێکهاتوە لە ــ بەل = پەل + ە پیتکە ــ • ناوە بۆ ئەو ڕێزەیەی کە بە پل = پەنجە دەهاوێژرێ دەش وترێ : بە پەلەپیتکە خۆی دەتەکێنێ • لێرەدا پەنجە لیدانەکە مەبەستە ، نەك هاویشتن بە پل و پەنجە •

شی کردنەوەیەك : ــ

« پیتك » وشەیەکی دارێژراوە لە « پیت + ك » بە هۆی ئەو پاشگرە دەبێتە ناوی تایبەتی ، وەك زەرتك = زەردك ، لەتك ، ناون بۆ شتی زەردو لەت بەرێژەی کەمی و گچکەیی ••• هتد •

**ئنجا بەرەو خوازەکاری :**

١ــ حەرفەکان پشتو پێزی وشەن و لەگەڵ شتی بەخێروبێردا میانەیان هەیە •

٢ــ وشە هەرچۆنێکی وردبکەینەوە ، لە دانەدانەو دەنگەوردیلەکان دروستدەبێ ؛ کەواتە بەجێیە ئەو کەرەسەزمانیەی کە پێی دەڵێن « تایپ » بەپیت ناودێربێ •• نووسەر هەر نووسەرێك بێ ئەگەر مان لە ویژدان نەگرێ ، تەنها « پیت » بەکار دەهێنێ و خوازەواتاکەش ئەوەندە میانەی پتەوە دەڵێی •• واتا بنجییەکە خۆیەتی •

سەرەڕای هەمووشتێك ئەو زاراوەیە زەمانێکی بەسەردا تێپەڕیوەو خوێندەواران پێی هۆگربوون • ، کەواتە بائەم لایەنی بەکارهێنانە پارسەنگێك بێ و سلاو بە لایەنە فیلۆلۆژیەکەشی بداتەوە • بۆیە ئەم باسەم بە تەسەلی وروژاندەوە تالەمەیدانی هۆشیاریدا یەكڕەتبین و هەر لە « ئەلفۆبێ » وە قوتابخانەی ڕاجیاوازی دروستنەکەین •

بێتو بەڵگەو لێکۆلینەوەی « تیپ » خوازان ، لەو بەراوردەی من بەهێزتر بێ ، بەلارەملیەوە دەستەونەزەری واقیعم •



*ـ٢ـ له رێنووسی کوردا شتێکی بەدیهی گێردراوەتەوە بۆ دۆخی خۆی که پیتەدەنگیی هەمزەو « ا » ی بزوێن هەڵهاوێژراونو سەربەخۆییـــان وەرگرتوەتەوە ، وەك جیاوازی پیتەکانیدی •

بەڵام لەبەرئەوەیکه بڕیارەکه لێکۆڵینەوەی لەتەکدانیەو دوای ئـەو هەندێ رێنووسەوان دوو پیتی / ء / و [ ا ] یان به یـەك داناونـەوە ، به پێویستم زانی کەمێکی لەسەر بڕۆم :

زۆر شت هەیه که وەك تیشك دەپەڕێته چاوو گەمەش بەزەینەدەکا •• به چاوپێداخشاندنی زۆر بەرهەمی رێنووس دەردەکەوێ کــه ئەولایــەنه ئاشکرایه لێلاّیی بەسەردا هاتوه ؟!

دووپیت که بێوانیان ئاسمانو رێسمانه بەیەکدا جۆشدراونو فەرەزیاتی سەمەرەیان له قەبرغه دراوە ، که دەنووسن :

« ا ــ ئەلف ، بــ ــ بێ ••• هتد » •

ئنجا هەندێکیان دەنووسن :

پیتی / ء / درێژدەبێتەوە وەك ( أ ، آ ، ا ) له لاتینشیدا بــه « A » دەنووسرێ •••• له عەرەبیدا بریتیه له « آ » •••

لەو دوو نیشانه تەقلیدیەوە ناهەمواری پەڕیوەته بەرهەمەکانەوە ؛ بیریان لەوە نەکردوەتەوە که ئەو دوو نیشانەیه ، دەوری بڕگه دەبینن = دەنــگ + بزوین یان لەپاڵ ئەوەدا دەوری بزوێن دەبینێ وەك لەلاتینیەکەدا •• بــەڵام له کوردیدا به رەوانی چارسەرکراوە وەك هەموو دەنگدارێك که به بزوێن دەجوولی ، وەك :ــ جا ، ما • ئا • مو • ئو ــ له عەربیدا جیاکراونەتەوە ، که به ئەلف دەستپێدەکەن مەبەستیان / ء / هەمزەیه « ا » ی بزوێنیــش به ئەلف ساکین دادەنێن • لەبەر ئەوەیکه بەتەنێ گۆناکرێ هێناویانه لـــه لاقی لامیان هالاّنووە وەك « لا » که بەلامەلفەلا حینجەدەکرێ مەبەســت

ئەوە نیە کە « لا » پیتێکی سەر بەخۆبێ ، هەر لەئەم رواڵەتەوە دانەرانـــی « ئەلفوبێ » ی قوتابخانەکانی کوردستان پیتی « لا ، لآ » ی سەربەخۆیـان گرداوە • کەهیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ ئەوەدا پیتی « کـا و گـا » ش سازبدەن ، شتێکی ئاشکرایە کە هەموو پیتێکی مەند بە هۆی بزوێنەکانەوە دەجوولێ ، بگریـن لەگـەڵ « ا » دا هەڵدەکشـێ لەگـەڵ « ی » دا ، دادەکشێ ••• وەك « ئا، وی ،قی » •

پیتی « ء » ی گەروو چ دەخلێکی بە « ا » ی بزوێنەوەنیە ، لـــە هەڵکەوتی ئەلفۆبێی عەرەبیدا تەنها لەگەڵ ئەوبزوێنەدا بـە « آ » لـــە لاتینیشدا بە [ A ] رەمزکێش کراوە • تاراددەیەکی باشیش زەینـی ترازاندوە لەو دوو شکڵەدا با ناهەمواریش‌بن دەقیان پێوەگیراوەو لەمێـژە ئێمە کاری خۆمان چارەسەرکردوە •

لە دوایینەی ئەم لێکۆڵینەوەیەمدا پەنا دەبەمە بەر تاقە شیعرێکـــی حاجی‌قادری نەمر ، کە دەفەرموێ : ـــ

« هەر وەك ئەلفی « جان » ستوونی لە سکوندا
نەك تابیعی غەیرەو متجرّك وەکو «هەمـزە»
ـــ حاجی قادری کۆیی ، بەشی دوەم ل ٢٣٨
لێکۆڵینەوەی مەسعوود محەمەد ـــ

لێرەدا مەبەستی حاجی ئەوەیە کە مەدحی رەشماڵی قەرەنیاغای مامەش بکا ، بە ستوونی وێستاوەوە •• لەو لایشـــەوە زەمی هەمزاغای مەنگـــوڕ بکا • لەم تەوریەیەیدا لایەنێکی زانستی گرتوە ؛ چونکە :ـــ

« ا » ی « جان » له خۆیدا بزوێنێکەو بە هیچ بزوێنێکی دی نابزوێو وەك ستوون ( له شکڵ ) (ا) داچەقیوە •• بەڵام هەمزە « ء » وەك هەموو پیتێکی دەنگدار دەجوولێو لەبارێکدا سرەوتی بۆ نیە ؛ ئەمە ئەو بارە زانستیەیە کە شاعیری نەمرمان رەوان بێژیانە بۆ مەبەستێکی دی خستویەتە کار •• ئەوەندێکی هەناسە بە بەریەوەبێ دەڵێین :

« ئا ، ئوو ، ئی ، ئێ ••• وەك : قا ، قو ، قی ، قێ ••• »



* ـ٣ـ تەنها نیشانەی « ه » دەست نیشانکراوە بۆ پیتی « ه » ی دەنگدارو پیتی « ە » ی بزوێن • من لەگەڵ ئەم بڕیارەی کۆڕدانیم ؛ ئەگەر بۆ بزوێنی « سەر = فتحە » کوردی ئیجا لە « ة » حاڵەتی وەقفەی عەرەبیەوە وەرگیرابێ ، رەمزە بۆ ئەرکێکی سەربەخۆو لە فۆنەتیکی کوردیداو لە فۆرمیشدا یەك نین • بێجگە لە ـ سەر ـ هیچیدی راناگەیەنێ وەك لە وشەی « هەزار » دا • ئەگەر یەك بن دەبێ بە یەکەوە نەنووسرێن و بە شکڵ نووسی « هزار » یان « ه زار » مەبەستبێتەدی !

قسەکەم ئەوە ناگەیەنێ کە لێژنە لەوە بێ ئاگابێ •• بەڵام بۆ چوونەکە بە کارێکی نەزەری رووتدادەنێم و لەگەڵ خواستی زمانەکەمان ناگونجێو بێتو لەریزی ئەلفوبێکەدا نەنووسرێ کەلەبەرێك بەجێ دەهێڵێو لە هەمزەوئەلفەکە سەختتر دەبێ •



* ـ ٤ ـ کۆڕ بڕیاری لەسەر پیتی «ص» داوە چونکە ئەو دەنگە لە هەندێ وشەی وەك « سەد ، سەگ » دا ، دەردەکەوێ •

من نالێم کە دەنگی « س » لە چەند وشەیەکدا بە قەبەتر گۆناکرێ ، بەڵام زۆر ناچارنەبین رەوانیە زمانەکە بار گرانبکەین •• تەنها گۆکردنی « صەد ، صەگ » یان چەند وشەیەکی کەم بە نیمچە صاد ئەوەناهێنێ و دەرگا دەخاتە سەرپشت بۆ تێچڕاندنی چەند پیتیدی وەك دەنگی « ط » لە کرمانجی سەروودا ، بە زەقی پیتی «ث» لە هەورامیدا ،پیتی کافی شێوەتورکی لە هەندێ حاڵەت و برێ ناوچەدا •• دالی نەرم لە ئاخاوتنی گۆرانداو جۆرەها قورس و سووکی لە دەنگەکانیکەداو هیچیان لە پیتی ( ص ) کەمتر نین • بەش بەخۆم کاتێ دەڵێم « سەد » هەست بەدەربڕینی دەنگی صاد ناکەم ، مەگەر زور لەخۆم بکەم • وەك سەرنجمداوە هەر لەتازە ـ ئاخاوتنی سلێمانیداو لە ماوەیەکی کەمدا دەنگی « ط » پەڕیوەتە قسەی خانمانەوە کە بە خۆپیشاندانێکەوە دەڵێن « طەواو » کەواتە بۆ پەیدابوونی ئەمیش دەبێ پیتی « ط » ش بێتە گۆڕێ ؟!

من لێرەدا بەڵگەیەکی ژیربێژیانە دەخەمەکار :ـ

هەروەکو لە زمانی عەربیدا ئەم وشانە هەن : ( سار = رۆیشت ، ثار = شۆرشیکرد ، صار = بووبە ••• ) • ئەگەر لە کوردیشدا وشەی « سەگ » بە سین هەیە بۆ بێجگەی کسۆك و وشەی « سەد » بە سین هەیە بۆ بیجگەی ئەوژمارەیە ( ١٠٠ ) ئەوا هێنانی پیتی « ص » بۆ جیاکردنەوە نەك بەجێیە بەڵکو هەرە پێویستە •

هەندێ زمانەوانمان پیتی « ص » دەبەستنەوە بە ئاوێستاوە ، ئەگەر بش سەلمێنرێ و مردوو زیندووبکەینەوە دەبێ چەندان جۆرەپیت و چەندان کاف بهێنینەوەگۆڕێ ، لە کاتێکدا چەندان دەنگی زیندومان هەن و رێنووسی ئاسایی دەرەقەتیان نایە •

ڕێگە لەوەش نەگیراوە کە لە ڕێنووسی فەرهەنگیدا هیما بۆ هەموو جۆرە دەنگێك بکرێ •• جا دەنگەکە میراتی بێ یان دورکی بێ و خۆی لەکوردی خزاندبێ •



* ـ٥ـ ڕەمزو نیشانەی جیاکەرەوە لەنیوان پیتەکاندا :

أ ـ خاڵ ـ لەبەرئەوەی کە پیتە عەرەبیەکان بەچەند فۆرمێکی ناتەواو دابەزیون و چەندان شکلی هاوبەش بەکارهێنراون بۆ دەنگە جیاوازەکان بەزەبەندی خاڵیان پێوەرکردون ، وەك « ط ، ظ » یان بە تاکەو بەکۆمەڵە لە سەرو بنیانەوە ، وەك : « خ ، ج ، ت ، ث » بە هەمان پەیڕەو کوردیش تەقلیدیانە خاڵی زیادکردوە ، وەك « ز ، ژ ، ج ، چ ، ب ، پ » ئەم خاڵە جیاکەرەوانە زیاد لە پێویست خراونەتە کارو ، باری نەفسییان پێڕاهاتوە بیرلەوە ناکرێتەوە کە خاڵدانان چەندە زەحمەتە لەنووسیندا ، هەرناتوانین بڵێین : « ژ » بە دوو خاڵ لە « ز » و « چ » بە دوو خاڵ لە « ج » جیادەبوونەوە ، کەچی « ٣ » خاڵیان بۆ دانراوە ؟!

لەو ئەرکە بەولاوە خاڵ بۆ هەر مەبەستێکی دی بخرێتە سەروبنی پیتەوە مایەی ئاڵۆزیە •

ب ـ دووبارەکردنەوەی پیتی گیراو لەباتی گیراوی « شدّة » لەمبارەیەوە ڕێنووسی کوردی دەقی خۆی گرتوە ؛ هەر پیتێ گوشراوبێ دوپاتدەکرێتەوە ، وەك :

« ڕاددە ، پەککو ، هەڵلا ، « تەوواب » کە بە ئیملای کوردی بنووسرێ •

لەبێجگەی ئەو حاڵەتەدا دووپاتکردنەوەی پیـت بکرێ بـە رەمزی هەرشتێکی دی مایەی چەواشە بوونو لادانە لە دەستووری راســـتو دابینکەر ، ئەگەر بیانومان ئەوە بێ دووپاتکردنەوە لە زمانی کەشدا بـۆ چەندان ئەرك لەبرەودایە •• هەر ئەوەندە دەڵێم : لەوانەیە لەسەرەتاوە بـە هەڵە چووبنو تازەش لەوزەی دەستکاریدا نیە • بەڵام ئێمە بۆمـان هەیـە لاسایی‌ی هەڵە نەکەینەوە !

ج ــ چوکڵە : ئەوەی‌کە تا ئێستا لەسەری پێك‌هاتبین تەنها چوکڵـەی وێنە حەوتە « ٧ » بۆ دەنگی لاوازو قەڵەو ، یان سووك و گڕ •••

یان بۆ بزاوتنی دەنگی‌لارو کراوە ، وەك « ڕ ، ڵ ، ۆ ، ێ » •

د ــ دانانی کەشـــیدە « ــ » ئەویـش بەتەنـێ کـراوە بە نیشانەی دیفتۆنگ ، وەك « شۆن ، خۆن » لە دواییدا کۆڕی زانیـاری کـردی بـە نیشانەی « ێ ، ۆ » تیژ ، بێجگە لەوانەش بێتو رێنووسێکی فەرهەنگـــی سازبدەین ئەوا چەندان چوکڵەی دیمان دەوێو کارەکەمان لێ سەختتر دەبێ•

دانانی چوکڵەو کەشیدە تەنیا ملۆزمی پیتەعەربیەکان نین ، کەواتە بـۆ سەرنجدانی پیتە لاتینیەکانیش :ــ

وەك : ــ A ، Ş ، Ç ، Ō ، Ū ، Ī ، L̄ ، E

بزوێنو چوکڵە بە چ رێگەیەکدا دەپارێزرێن ؟

ئەگەر بمانەوێ وەك پیتە بنجیەکان لەنووســیندا فەرامۆش نەکرێن ، تەنها رێگە ئەوەیە کـە لە قاڵبـی پیتــدا بنووسرێــن ، ئەگینـا چەنـدە گرنگییان‌بدرێتێ ، جاربەجار لە بیردەکرێن • بەنموونە ( سەرو بۆری عەرەبی ) چونکە لەقاڵبی پیتدانین ، بەدەگمەن نەبێ لە نووسینی باودا نانووسرێـن ، ئەمەش عەیبێکە و چاوپۆشی لێ‌کراوە •

ئەوەی کە تەگەرەیەکی زلی خستوەتە ڕێ نووسی کوردیەوە دووپیتی « و ، ی » ن •• کە لەیەك فۆرمو شکلّدا نیشانەی دەنگو نیشـــــانەی بزوێنن ، لە حالّەتی دوەمدا دەوری کورتە بزوێنو درێژە بزوێنیش دەبینن• لە لاتینیدا بۆرو ژێر هەرچەندە بەپیت دەنووسرێن بەلاّم لەگەلّ دەنگداردا شکلّیان جیاوازە ، وەك n , W , y , ŧ , r̂

بیتو لە عەرەبیدا ئەم جیاکردنەوەیەمان بۆ بڕەخسایە ، باری شـــانمان سووکتر دەبوو راستییەکەو ناکرێ بەژێر لێوەوە ، وەك لەخالّی ( ب ) دا ، باس‌کرا ، کە دووپات کردنەوەی پیت بووە رەمزی پیتی گیراو ، بە هەمـــان شێوە بۆ هەر حالّەتێکی‌دی بێ کارێکی زۆرەملانەو باری ناچاریە •

لەم بارەوە ناهەقی کۆڕ ناگیرێ کە لەباتی دووپات‌کردنەوە کەشیدەی خستەسەر « ۆ ، ێ » تیژ ،

لەمەولا بە چڕی باس‌دەکرێ •

❋

❋ ـ٦ـ پیتی « ر ، ڕ » :ـ

لەنیوان زمانەوانانو رۆشن‌بیراندا کێشە هەر بەردەوامەو بەسێ شێوە « ڕ »ی گڕ لە «ر»ی نەرم جیادەکەنەوە :ـ

١ـ بە دووپات‌کردنەوە ؛ چونکە لە خۆیدا پیتێکی گیراوە و دەبـــێ لەسەر یاسای « زللە ، پەککو » دابڕێژرێ •

٢ـ دەبێ چوکلەی حەوتی بخرێتە ژێرەوە بــۆ ئەوەی لــەگەلّ « ژ » نەئالۆزێ •

٣ـ دەبێ هەر لەسەرەوە بێ ، بۆ ئەوەی لەسەر یەك رەتبێ ، وەك لە حاڵەتەکانی دیدا بەسەرەوەیەو بۆ دەستهەڵگرتنەوە ئاسانترە • بڕیاری کۆڕ لەسەر سێیەمە •

**بەراوردێـك :**

١ـ أـ پیتی ڕێی زبر لە کوردیدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نیـە لەگـەڵ ڕێی[1] نەگیراوی عەرەبیداو بەر دەستووری دووپاتکردنەوە ناکەوێ ، بەو حیسابەو لەو شوێنانەدا کە گیراوبێ بەرەنگاری چوارپات بوونەوە دەبێ ، وەك : « زەررە و زەرررره » لە مسقاڵەزەرررەدا •

٢ـ بیانووی رای دوەم کە لەگەڵ « ژ » دا ، دەئاڵۆزکێ ، بۆ چوتێکی لاوازە ، چونکە لە فەرزیکدا چوکڵەکە وێنە هەشت [٨] بوایە لەوانە بـوو زەین لێی بترازێ •

٣ـ دەخرێتە سەرەوە ؛ لەبـەر خۆشدەسـتیو یەکتەرزی بـــۆ هەمووشوێنەکان :

ئەمیـش ئەوەنـدە بەهێزنـیەو بــەر هەڵستـیکەی دێتەبـەرێو دەستهەڵگرتنەوە تەنها بۆ ئـەو چوکڵەیەنیە بەنمـوونە :ـ لە چاوگــی « تێپێچان » دا ، دە جار لەژێرەوە دەست هەڵدەگیرێتەوە ، پێشــــی رام بووین !

---

(١) ان الحرف الصوتي «ڕ» انما هو راء شديدة اللفظ بعض الشدة ، وليس هو بالراء المشددة في العربية ، مثل « کەڕ » / قواعد اللغة الكردية ، الجـزء الاول / توفيق وهبي .

بــ ڕێدەکەوێ پێنج چوکلەی حەوتاسا لەسەر وشەیەك جەلەدەبن ، وەك لە « دێڕدێڕێن » دا •• بەڵام بە خستنە ژێرەوە لەم وشەیەو بێجگــەی ئەودا ، دابەش دەبن‌و چاو ناترازێ وەك بنووسین :

« دێڕدێڕێن » •

من رای دوەم پەسنددەکەمەوە ؛ چونکە سەرەڕای ئەو هۆیانــــە ماوەیەکی بەرینە نووسەران پێی هۆگربوون‌و چوکلەکە دەخەنە ژێــرەوەی ، تەنها ئەم پێ‌رازی‌بوونە دەکەمە بەڵگەیەکی بەهێز • خۆ ئەگەر هەڵەبوایــە لەسەری سوورنەدەبووم ، لەسەرەوەبێ یان لەژێرەوەبێ جەوهەری مەبەست ناگۆڕێ‌و گرنگ ئەوەیە لەسەری ڕێك‌بکەوین •

* ٧ــ پیتی واو :

نیشانەو رەمزی « و » لە کەموکووڕی‌ی ئەلفوبــێ / یەکەمانەوە دوو ئەرك‌دەبینێ :

/ و / ی‌دەنگــدار :

باری رەسەنی‌ی لە کوردیدا ئەوەیەکە لە گۆکردنیدا لچولێو پــــزو ئاسایی کۆناکرێنەوە وەك لە / و / ی‌عەرەبیدا دێتەگوێ ، بەڵکو لــــە کوردیدا لچولێو خونچاسایی دەپشــکوون و کەمــێ پەخ دەبنــەوە وەك لەسەرەتای زەردە خەندەدا ••• نزیك‌دەبێتەوە لە دەنگی « ڤ » کە بــۆ ئەویش بە ئاستەم لچ دەدا لە ریزەددانی سەرو • سازگەی دەنگی / و / وا هەڵکەوتوە کە بە مەندی وێستەی لەسەرناکرێ و هەناسەدار هەر لەبەرئەو خاسیەتەیە کە بزوێنیشی لەگەڵ ــ نەبێ ، پێی‌دەوترێ « نیمچە بزوێن » لەبەر ئەوە مامەڵەی تایبەتی لەگەڵدا دەکرێ ، وەك دەنگە مەندەکانی‌دی نیەو بــە چەشنی پیتی / ی / نەرم‌و نیانییەکی تایبەتی هەیە •

١ ــ لەبەرایی‌ی وشەوە هەمیشە دەنگدارەو بزوێنیشـــی لـــەدواوە زەق نەبێتەوە حیسابی نیمچە بڕگەی بۆ دەکرێ ، چونکە لەباتی نیمچە ژێر[٢] نیمچە بۆرێك لەگەڵ خۆیدا دەسازێنێ و بە وێستاوی لەسەرەتاوە گۆناکرێ ، وەك : « وشە ، ورچ ، ورگ » هەرچەندە لچولیو زەحمەت بدەین ناتوانـین بەنموونە ئەو سێ وشەیە لەسەر کێشی « کشە ، کرچ ، زرگ » گۆبکەین ، بەڵکو لەسەر کێشی یان نزیك بە کێشی « گوشە ، گـورچ ، گـورگ » گۆدەکرێن •

هەندێ کەس زۆر لە لچولێوی خۆیان دەکەن کە دەبینن نووسـراوە « ووشە » جووتە [وو] زەق‌بوەتەوە ، حیسابی درێژەبزوێنی بۆ دەکەن وەك لە « رووش » دا ، ئەم زەین ترازانە لە هەڵبەزینەوەی روانینی جووتـــە واوەکەوەیەو هێشتا ئەو مەلەکەیەیان بۆ پەیدانەبووە ، کە ( و ) ی بەرایـی دەنگـدارە •

٢ــ واوی دەنگدار لەدوای نیمچەبڕگەوە : واتە خۆی نیمچەبڕگەنەبێ ( وەك لە خاڵی یەکەمدا باس‌کرا ) ئەوسا لەپێش خۆیەوە نیمچەبۆر سازدەدا ، وەك : « چۆ / وار ، خۆ / وا ، ك / وا » • لەرووی ئیمـــلاوە : / و / ی دەنگدار لـە پێشـــەوە نیمچـە بـــۆر ســازبـدا وەك لـە « خوا »دا یـــان لـە دواوەی وەك لـە « ورچ » دا ، نووســـین‌و نەنووســـینی نیمچەبۆرەکە یەکسانە ، کە بەراست زانرا بنووسرێ [ ووریا ] دەبێ رێگــە لەوەش نەگیرێ‌کە بنووسرێ « خو / وا ، چووار » کەچی تائێستا نووسینی حاڵەتی یەکەمیان بە جووتە واو و دوەمیش بەیەك واو دەقی‌پێوەگیراوە ، تەنها

(٢) نیمچەژێر ، یان ژێری‌فرەکورت لەباتی « کسرە مختلسـە » بەکـــاری دەهێنم ، هەندێ کەس لەسەر ئاهەنگی عەربیەکە ناوی دەبەن بـــــە بزرۆکە = لەسەر کێشی « مزرۆکە » .

کۆڕی زانیاری لەو بارەیەوە کارێکی بەجێی فەراهەم هێناوە ، کە وێنـەی « وشە » بەیەك واو دەنووسێ ، پێجگەلەوەش بارسووکیە بۆ کەلەکەنەبوونی چەند واوێك وەك لەم رستـەیەدا :ــ چوووونبوو ــ ئەگـەر کـردارى « بوو » لەسەر ئاخاوتنی گۆرانیو ئەردەلانی دەربڕینو بێنووسین ئـەوا بەم چەشنە دەبێ « چوووونووو » ، رستەی لەمە سەمەرەتریش هەیـەو لە سەری ناڕۆم ۰

کەمێ لەمەوبەر ئەوەم درکاند کە : هەموو شتێك بەشکڵو نیگـاری تایبەتی رەمز کێش ناکرێ ، زۆر لایەن دەسپێردرین بە دەستوری رێزمانیەوە، وەك ئەم دەستوورە :ــ

« هەموو واوێکی بەراییی وشەو هەموو واوێکی سەرەتای بڕگە بەمەرجێ پیتی دەنگداری لەپیشەوە هەبێ نیمچەژێر بە نیمچەبۆر دەشکێنێتەوە ۰۰۰ »

کەئەمەزانرا ئیدی پێویستی بە نووسینی جووتە واو ناکا ، وەك لـەم نموونانەی خوارەوەدا :

أ ــ خـ / وار ، ب / وار ، بـر / د / وە بـەلاتینـی :
Xiwar , Biwar , Birdi We ئەم مامەڵەیە لەگەڵ واوەکەدا قورسی پەیـدا دەکاو بەم شێوە دەردەبڕدرێن :ــ

خـُ / وار ، / ۰۰۰۰ Xuwar ۰۰ هتد کەسیش نانووسێ : [ خووار بووار ] ۰

ب ــ و / شە ، و / رچ = Wirig , WiSe کەچی دەق بەوەوە گیراوە بنووسرێ « وو / شە » ۰۰

٣ــ بەم هاوکێشەیە / و / هەمیشە دەنگدارە : « بزوێن + و ، یان ــ و + بزوێن » وەك :ــ کەوەر ، کاو ، نوا ۰۰۰

٤ــ لەباری ناچاریەوەیە کە هەمان نیشانەی دەنگدار بوەتە نیشـــانەی بزوێنیش ، وەك : لە « کورد » دا • بە لاتینی ئەم گرفتە چارەکراوە وەك :
**-- Kew , Kurd --**

ئەگەر بیر لەوە بکرێتەوە هەرچی پیتەبزوێنە لە قاڵبی پیتدابێو لـــە فۆرمدا لەگەڵ دەنگدارەکان جیابکرێنەوە ، ئەمە قسەیەکی نەزەریەو لـــە کێشی پیتەعەرەبیەکاندا نیە ، راهاتنو رای گشتیش لەولاوە بوەستی ؟!•••
دەبێ چ دەسەڵاتێك ئەوە بکا ــ ؟



٥ــ بۆری تیژو نیشانەی « وو » : دوای ئەوەیکە لەسەرەتاوە یـــەك « و » کرا بە نیشانەی کورتەبۆر ، جووتە « وو » سازدرا بۆ درێژەبـــۆر • هەرچەندە لە روالەتدا دوو واوە بەڵام تێکڕا نیشانەی یەك درێژەبزوێنـــە • بە درێژایی‌ی قۆناغەکانی رێنووسی کوردی لەو جووتە « وو » یـــــە کۆڵراوەتەوە ، / دەمە قاڵی‌ی / لەسەرکراوە ، تاراددەیەکی باش زەینـــی زمانەوانانی ترازاندوە ، لەوردەکاری‌ی دەنگ‌سازیدا •• زرِەدەســـتووری وای سازاندوە مەردم دەبێ ناوی‌بنێ « گەمەی زمان » !!

جارێ پەنجە بۆ ئەوە راناکێشم کە « ۆ » ی کەشیدەبەسەربێ ؛ یـــان جووتە « وو » بێ •• وا دەخوازێ‌کە لە بەرایی و کۆتایی‌ی وشـــــەوە کنەیەکی تێدابکەم :

أ ــ لەمەرجێکدا قسەکەی لەمەوبەر نەسەلمێنرێ « کە لەبەرایـــی‌ی وشەوە پێویست بەجووتەواو ناکا مەگەر لەچەند وشەیەکدا کە / ( و ) ی دەنگدار « وو » ی بزوێنی تیژی بێ بەدواوە وەك « ووون » = « خوێن » لەسەر کێشی « بوون » بۆ جیاکردنەوەی لە ( وون = گوم » بەحیســـابی نووسینی جووتەواو لەسەرەتاوە •

بەڵام لەسەر بڕیاری ئیستا بەم چەشنە جیادەکرێنەوە « ون = گوم »
« وون = خوێن »

دیسان لەسەر باوی جووتەواو لە بەرایی ــ وشەدا چەند واوێــــك جەڵەدەبەستێو دیمەنێکی سەیر دەخولقێنێ وەك لەم رستەیەدا بەشــێوەی گۆرانو ئەردەڵان ، کە بگوترێ :ــ « برینەکە خویناو ووەو وونی لێ‌پژیا » واتە : خۆیناو بووو خوێنی لێ‌پژا ٠

لێرەدا هەشت ــ و ــ ریزبووە ، ئەگــەر ئـەم رستەیە بەرێکــەوت دابنرێ ، خۆ جەڵەی پێنــج « و ٠٠٠٠ » زۆر ئاســاییە ، وەك « چــووو وون‌بوو » بەڵام کار بەئەوەندەوە ناوەستێ ، شتی ئاڵۆزتر بەرپادەبێ !

ب ــ لەکاتێکدا کە « وو » ی تیژ بەرەنگاری بزوێن دەبێ :ــ

١ــ لەگەڵ بزوێنی [ ــ ە ــ ] دا ، وەك :ــ « کەشکەکەم ــ ســــوو + ەوە » هەندێ زمانەوان دەهێنن « وو »ی دوای « سوو » کە یــــەك تاقەبزوێنە ، دوو لەتی دەکەن : یەکەمیان دەکەنە بزوێنی « ســ » دوەمیــش دەکەنە دەنگدارو سەرەتای بڕگە ، بەم چەشنە : ( سو / وە / وە ) ئەمەش نارەواو رواڵەتانەیە ، وەك ئەوە وایە کە بزوێنی « ا » دوولەت‌بکەین ، واتــە [١/١] یەك‌لەسەردووی بەلایەکداو یەك‌لەســەر دوەکەی‌دیــش بەلایەکــی دیکەدا ٠٠ !!

یان بەئاشکراتر هەمان وشە بە لاتینی بنووسرێ : « SU + ewe »

ئایا دروستە درێژەبزوێنی « U » دوولەت‌بکەین ؟!

هەر بەهەمان رواڵەت‌کاری لە رێزمانی پۆلی پێنجەمی ئامادەیــــدا ، تاکەبزوێنێکیان دوولەت‌کردوە ، کە دەڵێن :

« پاش‌گری ــ و ، وو ــ ی مازیی تــام » بەهەمــان هاوکێشــــەی شی‌کردنەوەی لەمەوبەر[٣] .

لێرەدا لاباسێك سەرهەڵدەدا ، ئەویش چۆنێتیی نووسینی نیشــانەی « وە » ی رابووردووی نیزیکە :

أــ بە دوای بزوێنەوە گیروگرفتی تێدانیە ، وەك : ( ســووتا + وە ، زانی + وە ) .

بــ بەدوای دەنگدارەوە ، وەك : ( هات + وە ) دوو شــێوەنووسینی لێ‌کەوتوەتەوە :

١ــ تەنها بە نووسینی نیشانەکەو گوێ‌نەدان بە نیمچەبزوێن ، کـــە دەنووســـن :

« هاتوە = Hatiwe » .

٢ــ بەنیمچەبزوینی « و » ەوە ، وەك :

« هاتووە = Hatuwe » .

هۆی ئەمە چیە؟..

وەك لەوەوبەر کۆلیمەوە کە / و / ی دەنگ بەدوای دەنگی وێستاوەوە قورسەو دەنگە وێستاوەکە بەنیمچەبزوێن « اشمام » کێش‌دەکاو پێ‌ویســتی بە نووسین‌نیە و لە چاپەمەنیەکانی کوردا دێتەبەرچاو کە ئەم لایەنەیـــــان پەیرەوکردوەو هەموارترە

*

(٣) مامۆستا تۆفیق وەهبی ، [ وو ] ی تیژ دووکەرت‌دەکا ، وەك : ( پاروو ــ ئەو پارو ــ وانە ) دەی‌باتەوە بۆ کەرتەی جەرگەی بزوێنەکە . / بـــۆ کتێبی ــ قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول .

٢ــ لەگەڵ بزوێنی « ا » دا :

وەك : ( بەڕوو + ان = بەڕوان ) نەك ( بەڕووان ) چونکە « وو » ی بڕگەی « ڕوو » بە زەبری بزوێنی « ا » دەبێتەوە بە دەنگدارو پیتی « ڕ » بەنیمچەبڕگە بەجێدەهێلێ ، بە هەمان دەستوور کە لەتەك بزوێنـــی « ە » دا بێ ، وەك : ( بەڕوەکە = Beriweke )

تێبینییـــەك :

« وو » ی تیژ لەگەڵ نیشانەی « وە » ی کرداری رابووردووی نزیکدا بەکورتی سوار دەبێو دەنووسرێ ، بە هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەکـــی چاپکراوە تازەکان سێ شێوە نووسین دێتەبەرەوە ، وەك :

أـــ « بوو + وە = بووەوە • »

بـــ « بـــ + وە = بوە • »

جـ ــ « بو + وە = بووە • »

سێیەمیان راستە ، چونکە کرداری / بوو لەخۆیدا بزوێنـــی هەیـــەو لەگەڵ نیشانەی « وە » دا ، چ بەرهەڵستێك‌نیە کە تێدابچێو قیاسی لەگەڵ ئەو کردارانەدا ناکرێ کە کۆتاییان بەدەنگدارە ، وەك لەم دوو کردارەدا ، بۆ بەراورد :

« هات + وە = هاتوە ، بوو + وە = بووە » • لەســـواربوونی ئـــەو تەنافەبڕگەیەدا [وو] ی تیژ نامێنێ •

هەرچەندە ئەم تێبینیەم ، تێهەڵچوونەوە بوو ، بەلاّم نووســــــینی « بوە » م زۆر دەکەوێتە بەرچاو لە نووسینی بڕێ زمانەواندا ، بـــۆ بـــاری دڵنیایی زەقم‌کردەوە •

بەرلەوەی هانابەرینە بەر جوتەواو ، یان کۆمەڵە واو یان بەکارهێنانی کەشیدە پێویستیمان بە دەستوور بووژاندنەوە هەیە ، دوای بشکنینێکی زۆر بۆم ساغبوەوە کە دەستوورێکی ناسکمان هەیەو پەیڕەو نەکراوە ، ئەمەش دەستوورەکەیە :ــ

« و ، ی » بزوێن لەگەڵ بزوێندا دەبنەوە بەدەنگ ، تەنها ئەم دوانە لەنێو بزوێنەکاندا ئەو توانایەیان هەیە » .

ئەو دەستوورە وەنەبێ شاراوەبێ لە نێو زمانەوانانداو ، بەڵام تائێستا لە ڕێنووسدا تاوتووی پێنەکراوە ، دیسان بزوێنی « و » کورتبێ یان درێژبێ کە بوەوە بەدەنگ لە بزوێنی دەشۆرێتەوە ، لە فەرزی دوولەت کردن دەربازدەبێ ، جا لەبەر ئەوەیکە سەرەی بزوێنی « ی » نەهاتوە تەنها بۆ ( و ، وو ) ی گەڕاوە بە دەنگ چەند نموونەیەك دەخەمە بەرچاو :ــ

| ا ــ بنووسرێ | ب ــ نەنووسرێ |
|---|---|
| پـــارو | . . . . . . . |
| پاروەکان | پارووەکان |
| بەڕوان | بەڕووان |
| بوەوە | بووەوە |
| = | یـــان |
| | بـــۆوە . |

وەك لە بەرەنجامیەوە دەردەکەوێ ، هەموو وشەیەك کە کۆتایی بە بزوێنی « و » بێ لە خۆیدا درێژە ، وەك : « بوو ، شوو ، دوو »

بەڵام مامۆستا تۆفیق وەهبی ، دەڵێ : « لا تنتهِ الکلمة بالحرکة « و » إلا في الکلمات الفعلیة ، مثل : « بو ، چو ـ من بوم ، من چوم ٠٠٠٠ »

له دەقی ئەو قسەیەوە بەرتەسکییەك بەدیدەکرێو جێی تێڕامانە !!

ماوەتەوە قسەیەك :

ئایا کە زانیمان بە دەستوورێکی گشتی هەموو « و » یەك لـە دوای وشەوە ( کە بزوێن بێ ) درێژە ، ئیدی پێویست بە جووتە « وو » دەکا ؟٠٠

یان دەتوانین بە دەستووری هەموو « و » یەك کە لە سەرەتـــای وشەوەبێ گرەو پێویستی بە نیشانە نیە ، ئاوایش جووتە [ وو ] بکەینـەوە بەتاکە « و » ؟

لێرەدا ویستەیەك دەکەمو دەڵێم : نەء ؛ چونکـە لەگـەڵ پەیـڕەوی دەستووری گشتیدا دەبێ حیسابێکیش بۆ باری راهاتنی نووسەران بکەین ٠٠٠ تێکرای رێنووسەوانەکان دەقیـان بە جووتە [ وو ] ی دوای وشـەوە گرتوە لەسەر یاسایەکی فۆنەتیکـیو سامانێکـی پـێنووسـراوەتەوە ، نووسینەکەشی بە لەقی‌نیە وەك لە [ ی ] تیژی دوای وشەوە پتر بـە یـەك [ ی ] دەقی‌پێوە گیراوە ٠ گوێ‌پێ‌نەدانـی دەبێتە بارێکـی زەحمـەتو لە قاڵبێکی نەزەریدا دەمێنێتەوە ٠

## [ پوختەی بەراوردو لێکۆڵینەوەکە ]

١ـ لە سەرەتای وشەوە واوی دەنگ بە ـ سروشتی خۆی نیمچەبزوێـــن رادەکێشێو بەبێ ئەو کورتەبۆرە گۆکردنی زەحمەتە ، وەك : بنووســـرێ : [ وشە ، ورد ٠٠٠ ] بلام بزرەو نانووسرێ ٠

٢ـ لە نیمچەبڕگەی پێش « و » ی دەنگدارەوە کورتەبۆرێ بەئیشـــــمام پەیدادەبێو هەموو لایەکمان بەوە رازی‌بووین کـە نەنووسـرێ ، وەك : « خوا ، جوان ، چوار » ٠

٣ــ هەموو بۆرێکی درێژ کە بەرەنگاری پیتەبزوێنیدی بوو دەبێتەوە بە ــ دەنگدارو پێش‌خۆی دەبێتە نیمچەبڕگە وەك : « بوو + ەوە = بــوەوە ، یان : بەڕوو + ان = بەڕوان » ٠

٤ــ نووسینی کورتەبۆر بەیەك « و » و بە شکڵی پیت ، دەمەقاڵی لەسەرنیە ٠

٥ــ درێژەبۆر لەنێوەندی وشەدا ، دەورێکی سەرەکی دەبینێ ئەگــــــەر بەدرێژی پیشان نەدرێ زیان بەمەبەســت دەگەیەنێ نەك هــەر لــەرووی دەنگ‌سازیەوە ، بێتو بەکەشیدە جیابکرێتەوە جارجار فەرامۆش دەکــرێ ، وەك :ــ کورِ ، کوورِ ، کول ، کوول ٠٠٠٠ »

بەڵام لە دواوەی وشەوە ئەو زیانەمان لێ‌ناکەوێ وەك : ( دوو ، دو ، شوو ، شو ٠٠٠٠ )

٦ــ بە پشت‌ئەستووری‌ی ئەو پێنج دەستوورانە بۆم هەیە کە بلێم پێ‌ویست بە کەشیدەی سەر « وو » ی تیژ ناکا کە بنووسرێ « ۊ » لەباتی جووتە واو چونکە بەو دەستوورانە تەوژمی ، زنجیرەواو بەتەواوی هاتەکزی ، بەبــێ ئەوەی زیان بە زمانەکەمان بگا ٠

*

* ــ٨ــ پیتی « ی » :

ئەم پیتەش هەناسەدارەو دەورێکی بە تەوژمی هەیەو لە سازگەیەکــی نەرم‌وشلەوەیە ٠

ئەگەر کەوتە تەك‌پیتی دەنگدار ، بۆی دەبێتە بزوێن‌و خۆ ئەگەر لەگەڵ بزوێندا کۆبوەوە دەبێتەوە بە دەنگدار ٠٠ هەر لەبەر ئەو توانایــەیە کـــە لەگەڵ « و » دا بە نیمچەبزوێن دادەنرێن ، واتە بەچەشنی ( و ) ئەمیــــش نیمچەبزوێنە ٠

*

چەند نموونەیەك بۆ « یـ / ی » دەنگدار :

- لەسەرەتای وشەوە : « یاد » بەشێکە لە بنجی وشەکە •
- لەنێو وشەدا : « پەیکەر » بەشێکی بنجیە •
- سەربەخۆبێ : « گەلای‌دار » ئامرازی پەیوەندیە •
- « بۆی‌هێنا » راناوی کەسی سێیەمی تاکەو تەواوکەرە •
- خودای دەناسم ــ راناوە بۆ دۆخی بەرکار • یان لە « نانی دەخۆم » دا؛ وەك وتم راناوەکە خۆی بەرکار « مفعول » نیە ، بۆ « حاڵەتی مەفعولیە »
- خۆی بەرکاربێ : « دەی‌خۆم » هەمان « ی » دەنگدار ، لەدوای پیتەدەنگدارەوە ، راناوەو بزوێنە ، وەك « بی‌خۆ » •
- لەدوای نیمچەبڕگەوە : « چیا ، ڤیان » •
- دەبێتە ئێنفۆنیك : « گەڕایەوە » دووبزوێنی لەیەكدی ترازاندوە •
- یان « وەك ئێنفۆنیك » لەنێوان دوو بزوێندا ، کە دوەمیان « ی » نسبەتە ، وەك لە « برا + یـ + ی = برایی » دا •

**نیمچە(٤) ژێر :**

ئیمچەبڕگە سازدەدا ، وەك لە : « بـِ / زن ، چـِ / یا » دا ، تائێستا لە ئەلفوبێی عەرەبیدا نیشانەی بۆ دانەنراوە ، بەلام وەك دەردەکەوێ لەبڕێ وشەدا بە « یـ » دەنووسرێ‌و ناش‌نووسرێ ، ئەمەش تەگەرەیەکی خستوەتە رێ‌نووسەکەمانەوە •• بەلی وا باوە کە نانووسرێ‌و هەرچی لە رێ‌نووسیش دواوە ، ئەوە قسەی بووە •• بەلام دوای پشکنین هەندێ وشەم بۆ دەرکەوتوە کە جاربەجار « بە سەلیقەی گۆ کردن » ئەو ژێری

---

(٤) نیمچەبزوێن بڕگەی تەواویش پێك‌دێنی وەك لە ( ژن ) دا .

فرەکورتە دەنووسرێ‌و حیسابی کورتەژێری بۆ کراوە ، بەنموونە دەنووسن : ( دایك ، گەییشت ) لێرەدا قورسە دەنگ لەسەر بڕگەی « یك » ە بە هاوکێشەی « یـ / دەنگ + دەنگی وێستاو نیمچەژێر پەیدادەبێ ••• بەلام نانووسرێ •• لە نووسینی لاتینیدا بە « i » دەنووسرێ ، بەلام هەمان نووسەر کە دەنووسێ « دایکم ، دایکە » چونکە قورسەدەنگ دەچێتە سەربڕگەی ( کم ، کە ) ئەو سا ( یـ ) بە مەندی گۆدەکرێ‌و نیمچەبزوێنی لەتەکدانیەو راستە ، وەك : لە « Day / ke » دا ئاشکرایە •

رام وایە کە لە حالەتی یەکەمیشدا ، نیمچەژێر نەنووسرێ ، هەروەکو لە حالەتەکانی دیشدا نانووسرێ

دیسان زەین لەگەل خێرایی‌ی نووسیندا ، ئەو مەلەکەیەی بۆ پەیدانابێ کە وێنەی « گەییشت‌و گەیشتە » لە یەکدی هەلاوێرێ ( نالێم لەئێرەدا ) بەگشتی مەسەلەی قورسەدەنگ « ئاکسان » بەستراوە بە تەوژمی دەربڕین‌و مەبەست‌و نیازی دەروونیەوەو لەوزەی دابین‌بووندانیە •



« ی ، یـ » کورتەژێر :

دوای پشکنین‌و بەراورد دەتوانین « ی » کورتەژێر دەست‌نیشان بکەین‌و لە ئەنجامدا ، دەستوورێکی رەوانی لێ‌سازبدەین :

١ـ کە دەبێتە ئامرازی پەیوەندی بۆ :

١ـ دۆخی ئیزافە ، وەك : لە « گەلی کورد » دا

٢ـ دۆخی وەسف : لە « گەلی ستەم‌لی‌کراو » دا

٣ـ راناوی کەسی سێیەمی تاك ، وەك :

أـ بکەربێ : لە « ئەوگرتی » دا •

ب موزاف‌ئیلەیهی بی ، وەك : لە « مالی وێران‌بێ » دا •

٣ــ بۆ کەسی دووەمی تاك لەرستەناودا وەك : لە « تــۆ کــوردی = کوردیت » دا • هەندێ زمانەوان ئەو راناوە ناودەبەن بە کرداری یاریدەدەر ( ڤیربتوبی ) •

٤ــ کە ببێتە پاشکوێ موزافئیلەیهی ، وەك لە دەستەشێوەی موکری‌و پشدەردا دەڵێن : « رەئووفی ئەحمەدی » یان « داوەلی هەرزنی • »

٥ــ راناوی کەسی سێیەم کە بەرکاربێ لە دوای نیشانەی داخوازیەوە ، وەك : لە « بی‌کوژەدا ــ • بەڵام لەهەمان رستەداو تەنها لەئاخاوتنی دێـــی ( گرگاشە ) لە ئالانی ئەمبەر ، چ بزوێنی « بی » و چ بزوێنی « کو » بـــە دریژی گۆدەکەن : « Bikuje » هەرچۆنێ‌بێ دەربرین‌و نووسینی بـــە کورتی لە نووسینی باودا رەتی خۆی گرتوەو هەموارترە •

« کورتەبزوێنی « ی » لەو حاڵەتانەدا بەیەك « ی » دەنووسرێ ، لـــە رووی شکڵ‌نووسیەوە ئەو گیروگرفتەی تێدانیە ، کە لەدوای وشەوەبـــێ ، لـــە رێ‌نووسی کۆندا نای‌لکێنن ، وەك لەمەولا لێی‌دەکۆڵمەوە بەراســـتی نازانم‌و رێ‌رەوی کۆڕی زانیاری پەسنددەکەم •



**« ی = ا » دریژمژیر :**

١ــ لەتێوقەدی وشەو برگەدا ، هەمیشە داکشاوە ، وەك « بـــیر[٥] ، پەنیر ، ژین ، شیرین ، نووسین ، پشیلە ••• »

چاوگی یائی بەرئەو بەشە دەکەون •

---

(٥) هەندێ زمانەوان رایان‌وایە کە لە وێنەی ( بیر ) دا ، یەك ( یـ ) بنجـــی هەیە ، دوایی بزوێن وەردەگرێ‌و دەبێتە دوان ، وەك ( بییر ) . ئـــەم رایە لەزمانە سامیەکاندا دەگونجێ . کـــورد شـــیری لە ئەسڵدا بـــە دریژەبزوێنەوە دابەزاندوە .

٢ـ راناوی کەسی دووەمی تاك ، لەدوا کرداری رانەبووردووەوە ، وەك :
( دەمری ، ئەگەر بژی ، نەژی = دەمریت ، بژیت ... )

بەرلەوەی‌کە ، کەشیدەی کۆڕی زانیاری دابەزێ ( ێ ) بەدەگمەن نەبێ لەو نموونانەدا بەیەك « یـ ، ی » دەی‌نووسین ، تەنانەت کوڕیش هەمدەم کەشیدەکە نانووسێ .

٣ـ راناوی دۆخی بەرکار ، کە بەرەنگاری (ی) راناوی کەسی سێیەم نەبێ ، وەك :

ـ نانی دەخۆم ـ هەرچۆنێکی بنووسین لە خۆیدا تیژەو داکشاوە.. بەڵام لەهەمان ئاخاوتندا کە راناوی کەسی سێیەم وەربگرێ بە کورتی گــــۆ دەکرێ‌و ، راناوەبەرکاریەکە تێ‌دەچێ ، سەلیقەی ئاخاوتنەکە وای‌خولقاندوە ئەم دەنگ‌سازیە لەبەریەکانگیربوونی دوو « ی‌ی » نیە ، کە بەیەکـــەوە گۆناکرێن ، ئەگینا بۆمان هەبوو بڵێین با راناوی کەسی سێیەمەکە تێ‌بچێ ؟. بۆ بەراوردی ئەم دوو رستەیە : ( من نانم خوارد ) نابێژرێ : ( من نانیـم خوارد ) بەراناوی بەرکاریەوە ، ئەوا دیارە کە هیچ بەرهەڵستێك لـــــە گۆڕێدانیە . کە دەوترێ : « ئەو نانی خـــوارد » رانــاوی کــارا « فاعل » بەکورتە بزوێن دەردەبڕدرێ ، دیسان هەمان رستە لە دۆخی تەمەلوکدا ، وا دەخولقێ کە نیشانەی ئیزافەکە بنووسرێ‌و راناوی بەرکاری فەراموش‌بکرێ، وەك : ( نانی ناخۆم = نانی ئەو ناخۆم ) ئەم لایەنە دەهێڵمەوە بۆ بەراوردێکی سەخت .

* راناوی بەرکاری لە دۆخی نێرو مێدا :

١ ـ لەفارسیدا : بۆ هەردوو بارەکە پاش‌گری «را» دەیاردەیەکی زمانەکەیە ، وەك : مەردێ «را» گورفتەم ، زەنێ «را» گورفتەم .

٢ ـ لەکوردیدا (سوپاس بۆخوا) ئەم باری «معمولیة»ە نەچڕاوەتە زمانـی نووسینەوە ، چونکە لەمەڵبەندی ئاخاوتنی زمانە ئەدەبیەکەدا باونیە .

له دەستەشێوەی موکری‌و سەرسنووری شارباژێر ، دەڵێن : (نانی دەخۆم ، ئاوێ دەخۆمەوە ، ئیشێ دەکەم ) تومەز «نان» نێرەو «ئاو» مێیە ؛ بۆ ئەویان « ی » و بۆ ئەمیان « ێ » لەکاردایە • زانست بێ‌پەروایەو شەرمی بۆ نیە : لە حاڵەتی مەفعولیدا (قنگ) مێیەو کونەکەی‌دی نێرە، وەك « قوونــێ‌و ــ •••ی ــدادەپۆشـــی » ؟! دەوجا وەرە سەری لێ دەربکە •• ؟!

٤ــ « یــ ، ی » نیسبەت ، هەندێ زمانەوانمان بە چاوێکی تەقلیــدی سەیری دەکەن ••• بەڵام یەکێکە لە کەرەسەرەسەنەکانی زمانە ئێرانیەکــان زمانی کوردیش یەکێکە لەو کۆمەڵە زمانەو کێشەی لەسەرنیە • بۆ داڵدەی قسەکەم شایەدی‌ی زمانەوانی عەرەب دەهێنمەوە ، کە دەڵێ لە بنجــــــدا « ی » داکشاوی نیسبەت ملکی فارسیە • دیــارە ( بەولا ترەوە ) هـــی کوردیشە ، کەواتە بۆئەم ( سەرچاوەیە : القواعــد الاســاســية لدراســة الفارسية ، ص ــ٢١٧ــ • تأليف الدكتور ابراهيم امين الشواربى ) •

نموونە بۆ ئەم « یــ ، ی » تیژە وەك :

( کوردستانی ، شوانی ، کوڕی‌زانیاری ••• )



**رای گشتی‌و رای تایبەتی لە چۆنێتی‌ی نووسینی « ی » تیژ یان داکشاودا :ــ**

ــ بە قسە ، زوربەی نووسەرانو رۆشــن‌بیران لەسەر ئەوەن کـــە « ی » تیژ بە دووبارە خۆ بنووسرێ ، لەسەر یاسای جوتە « وو » کـــە بۆ درێژەبۆرە •

لەدواییدا ئەنجومەنی کــۆڕ بڕیــاری کەشــیدەی لەســەر دا ، وەك : ( زانستێ ، نووسین ) •

یەکەم لەبەرئاسانی ، دوەم بۆ پاراستنیو خۆ دوورخستنەوە لەکەڵەکەی چەند « ی » یەك لەهەندێ حاڵەتی تایبەتیدا ، دیسان بڕیاری کۆڕ لەسەر ئەوەیە کە « ی » ئامرازی پەیوەندی بۆ دۆخی ئیزافەو وەسف ، هەروەها « ی » راناو بۆ کەسی سێیەمی تاكو بۆ کەسی دوەمی تاك ( لەگەڵ ئەو کردارانەدا ، کە لەچاوگی یائین ) نەنووسرێن بەدوای ئەوو وشانەوە کە کۆتاییان بە « ی » بزوێنە ، وەك بنووسری ( ماسیی گەورە ) و نەنووسرێ ( ماسیی گەورە ) بنووسرێ ( ئەو زانیی ) و نەنووسرێ ( ئەو زانیی ) •

بزوێنی « ی » کە لەخۆیدا لە پیتەلکاوەکانە ئایا لەو کاتانەدا بەرەنگاری بڕگەی دی دەبێ بەجیا دەنووسرێ یان دەلکێن ؟

پەیڕەوی دوو ڕێچکەکراوە ، یەکەمیان ( ڕێگەی بڕگەیی ) دەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەوی نووسینی مامۆستا تۆفیق وەهبی • مامۆستا نوری عەلی ئەمینیش لە رابەرەکەی خۆیدا هەمان رەتیگرتوەو دەڵی پیتی « ی ، ێ » لە کۆتاییدا لە پیتەلکاوبن تووشی تەگەرەمان دەکەن •• / بەلآم تەگەرەکانی دەستنیشان نەکردون •

ڕێچکەی دوەمیش لە چاپەمەنیەکانی کۆڕی زانیاریدا پەنجەی بۆ رادەکێشرێ •• بەلآم بە لێ وردبوونەوەی بەرهەمی نووسراوە بە هەردوو باردا نەتاسەر ( ئەو دووپیتە ) لکاونو نەسەرومڕ نەلکاون ••• ئەم نایەکسانیە گیروگرفتێکی وای خستوەتەوە ، باوەڕناکەم بەئاسانی بەسەریدا زاڵببین • بەر لەوەی کە بکەومە شیکردنەوەو نموونەهێنانەوە پەیڕەوی کۆڕ پەسندەکەم کە دەنووسن :ـ

« زانستیە ، پێی » و نانووسن « زانستییە ، پێی »



## بزوێنی « ی » لەگەڵ بزوێندا :

١ ـ لەگەڵ بزوێنی [ ـە ] دا :ـ

« کردی :ـ کردییەوە ـ کردیەوە ـ کرِدیِیەوە • زانستی :ـ ئـــەو زانستییە ـ ئەو زانستیِیە •

کانی + ەکە ـ کانییەکە ـ کانیەکە ـ کانیِیەکە •

قوتابی + ەکە ـ قوتابییەکە ـ قوتابیەکە ـ قوتابیِیەکە •

نانەوایی + ەوە ـ بە نانەواییەوە ـ بەنانەوایەوە ـ بەنانەواییِیەوە •»



٢ ـ لەگەڵ بزوێنی « ا » دا :

قوتابی + ان : قوتابییان ـ قوتابیان ـ قوتابیِیان •

نانەوایی + ان : نانەواییان ـ نانەوایان ـ نانەواییِیان • / ئەگـــەر « ی » داکشاو بە دووبـــارە بنووســرێ دەبێتـــە : ( نانەوایـــــیِیان ـ نانەواییِیان )

لەسەرتاپای ئەو نموونانەدا ، بە نەزەری و کردەوەیی کامیان گونجاوترە ، هێشتا سەرەی حوکمدان نەهاتوە •



## نمایشی وشەیەکی زەق :

نی + م / راناو + ــ ه = نیمــه •

نی + ــ ه / راناوێ یان کرداری ڤێرب‌توبی‌بێ :

نی‌یه ــ نییه ــ نیه ــ « Niye »[٦] •

ئەگەر گومانی ئەوە ببرێ ، کە بێتو بنووسرێ « نیه » لەسەر ئاهەنگی « تِیه° » ی‌عەرەبی دەخوێنرێتەوە • بڕواناکەم ؛ چونکە لە « نیه » دا پیتــی ــ ن ــ نیمچەبڕگەیە نیمچەژێرەکەی نانووسرێ کە بەلاتینــی « i » یە • پیتی « یــ » دەبێتەوە بە دەنگدارو سەرەتای بڕگەی تەواوە •

پیتی « ه » تەنها سەر = فتحەی رووت دەردەخا ئەگــەر بە « هــ » ی‌چاوسپیکەلە بنووسرایە وەك : ( نیهــ ) ئەوگومانە دەبڕا ، ئەگەر بخرێنە سەرشێوەی لاتینی ئاوادەنووسرێن [ NiH -- Niye ] و باری ئالۆزییان تیدانیــه •



### ٣ ــ لەگەڵ بزوێنی « ێ » دا :

« قوتابی + ێك ( بە دەســتوری بــەرد + ێــك ) ؛ دەنووســرێ : « قوتابی‌یێك ــ قوتابی‌ێك ــ قوتابییێك ــ قوتابییــێك ••• هەروەهــا ــ ترۆزێك ــ ماسییێك » • نووســینی چوارەمــم بەلاوە هەموارترە ؛ بــە

(٦) تێ‌بینیەکی پی‌ویست :ــ

ماموستا شیخ محەمەدی خاڵ کە زۆر فۆنەتیکیانە دەنووسێ زۆریــش سوورە لەسەر نووسینی جوتە « ی » لەسەرتای فەرهەنگەکەیــــدا دەنووسی « نیه = Niye » و کارێکی پەسندە / بۆ فەرهەنگــی خاڵ جزمی یەکەم ل ٣١ دێری « ١٦ ، ١٧ » .

دەستووری « یـ » بزوین بەزەبری « ێ » ی بزوێن دەبێتەوە بە دەنگدارو سەرەتای برگەو لەنێوان خۆیو کۆنسوناتی پێشەوەیدا نیمچەژیری ( i ) رادەکێشی وەك لەمەوبەر لە وێنەکانی ( چیا ، جوان ... ) دا شیکرایەوە . کە پەیرەوی ئەم دەستوورە ناسکەمان کرد پێویستمان بە سازدانی بەنـدە فۆنیمو ئینفونیك ناکاو نانووسین : ترۆزی + یـ + ێك = ترۆزییێـــك . ئەمەیان تائێرە . بەلام هەر لەزمانی ئەدەبیماندا دیاردەیەکی ئاساتترمان بـە دەستەوەیە ، کە دەلێنو دەنووسن : قوتابی ، کانی + یەك = قوتابییەك یان قوتابییەك = واتە یەك تاقە قوتابی نادیار لەتوخمی تاکەتاکەی قوتابیان ، من پەیرەوی ئەم دیاردەیەمکردوە . وای بۆدەچم کە دەلێن « بەردێك » لـــە ئەسلدا ( بەردیەك ) بووبێ ، برگەی ( یەك ) کە کراوەیە دەنگی وێســتاو لە پێشیەوە گیرو قورسەو ( یە ) شکاوەتەوە بە ( ێـ ) ی بزوێنو دەنگەمەندەکە رادەکێشـــێو دەبێـــژرێ : ( بەر / دێـــك ) لەباتیی ( بەرد / یـــەك ) کـــە کۆنسوناتی ( ر ، د ) بەگیری و مەندی دەمێننەوە .

بێجگە لەو دیاردەیە پێویستمان بە لێکۆلینەوە هەیە کە بزانـــرێ : [ یەك ، ێك یێك ، ئێك ] لەمانە کامیان بنجیەو هەموارترە .. هیچ بەتەنگ ئەوەوەنیم کە بنجیەکەیان لەهەرێمێکی تەسکی کوردستاندا بەکاربهێنرێ ؛ چونکە مەسەلەی زانست وەك کەپۆرەی پەرلەماننیە ، ژمارەی زۆر هەموو شتێك بسەپێنێ .



## ئـەنجـــام :

ـ دوای ئەوەی کە زانراو سەلمێنرا « و ، ی »[٧] بزوێن لەگـــــەڵ بزوێندا دەبنەوە بە دەنگ‌و لەهەمان کاتدا نیمچە بزوێنی دەنگی وێســتاوی پێش خۆیان بە ئیشمامی:«بۆرو ژێری فرەکورت»رادەکێشی‌و لە رێ نووسی بە ئەلفوبێ / ی عەرەبیدا نانووسرێن ، ئیدی پێویست بە ئێنفۆنیکی زێدە ـ و ـ و زێدە ـ یـ ـ ناکا ، کەواتە :ـ

| بنووســـرێ | نەنووســرێ |
|---|---|
| کردیەماڵەوە | کردییەماڵەوە ، کردی‌یەماڵەوە |
| زانســـتیە | زانســتییە ، زانستی‌یە |
| زانســـتیەك | زانســتیەك ، زانستی‌یەك |
| قوتابیـــان | قوتابییان ، قوتابی‌یان |
| نانەوایـــان ( کۆ ) | نانەواییان ، نانەوایی‌یان |
| نیـــە | نییــە ، نی‌یــە ... |
| کانیێــك | کاتێك ، کانییەك ، کانی‌یێك |

(٧) تێبینییەکی پێویست :ـ
کە دەڵێین : « و ، ی » بزوێن لەگەڵ بزوێندا دەبنەوە بەدەنگ » ئەمــە کاتێك‌وایە کە بزوێنەکەی دواوەیان لەتوخمی خویان نەبێ ، بەنموونــە لە ( « ماسی‌ی » گەورەدا ) « ی » ئیزافەکە « ی » بنجی‌یەکە ناکاتـــەوە بـ دەنگـدار .

✻ تێبینی :ـ ئەگەر لەدوای بزوێنی « یـ » وەوە پیتــە دەنگـداری « یـ » هات ، تاهەناسـە بڕبکا بزوێنەکە وەك خۆی دەنگ‌رادەکێشێ ، نابێتەوە بە دەنگ‌و ئیشـمام نایەتەگۆرێ . بۆ ئەم هاوکێشـەیە :
زانسـتی + ەکە = زانسـتیەکە =

Zanistiyeke



**[ گیروگرفتی « ی » بزوێن لەگەڵ راناوی کەسی دوەم و سێیەمی تاک و ئامرازی پەیوەندی بۆ دۆخی ئیزافەو وەسف ... ]**

**لەنێوان رێنووسی کۆن و نوێدا :**

ــ ئەگەر « ی » تیژ بە کەشیدەوە بنووسرێ زیاتر ماوە هەیە بــــۆ نووسینیان وەك :

( ترۆزێی ناسك ، بێی دەمچەم ، ئەو دزێی ) ئەگەر نەش نووسرێن سەبارەت بەکەشیدەکە ئاڵوزی پەیدانابێ ؛ چونکە بە داکشاوی دەیسەلمێنێ کەئەو « ێ » یە نەراناوەو نەئامرازە چونکە لە خۆیاندا کورتن • مامۆســتا مەسعوود محەمەد لە لێکۆلینەوەی رێنووسی کوردا ، دەلێ شتێك کـــــە نەخوێنرێتەوە دەبێ حیسابی مردوی بۆ بکرێو مردوزیندوکردنەوەش کارێکی ناژیرانەیە •

ــ لە رێنووسی کۆندا مامۆستا تۆفیق وەهبی ( بۆ نامیلکەی ــ قواعد اللغة الكردية الجزء الاول ) : بە نیشــــانەی « ء » وە سوورە لەســــەر نووسینیان ، وەك ( تانجیء راو ، تانجی پاشا ) • بە کورتبرییەکەوە ئــــەو بریارەی داوەو فریای لێکۆلینەوە نەکەوتوە

ــ لە رێنووسی باودا ( کە سەربە رێنووسی کۆنە ) تائێستا پەیرەوی نیشانەی هەمزە نەکراوە ، دانانــی کەشــیدەش لە چــوار دیــواری کــورِ نەچووەتە دەرێ •

---



| | |
|---|---|
| زانستی + یەك = زانســتییەك = | Zanistiyk |
| زانستی + یان ( راناو ) = زانســتییان = | Zanistiyan |
| زانستی + ان ( کۆ ) = زانســتیان = | Zanistiyan |

ــ ئایا له رێ نووسی کۆنو باودا « ی » تیژ بەتەنێ دەنووسرێ یـان به دووبارەو تا چ ئەندازه ــ یەك پەیڕەوکراوه ؟

به لێوردبوونەوەی زۆر تێکستو بەرهەمی نووسەرانی کورد ئەمەی خوارەوەم بۆ دەرکەوتوه :

ــ « ی » تیژ که بنجی بێ ، وەك له ئەمانەدا : ( بیر ، زین زانـین ــ ماسی ، کوردی ، سلێمانی تەنها مامۆستام [ شێخ محمدی خاڵ ] به دووباره ئەو بزوێنه داکشاوه دەنووسێ : [ بۆ فەرهەنگی خاڵ جزمی یەکەم ] • بەلاّم له کۆتاییی وشەدا له قالبی بڕگەی « یی » دا ، دووبارەی دەکاتەوه ، وەك : ( ماسیی ، کوردیی ) ••• هەرچەند بەچالاکیی ئەو دووبارەکردنەوەیـــه ئیملاکەی خۆی دەقدارکردوه نەیتوانیوه سەرومڕ بەسەر هەموو وشەیەکدا زاڵ ببێو له تێکڕای نووسینەوەی فەرهەنگەکەیدا ئـەو شێوەبواردنـــه دێتەبەرچاو •

ئیـدی ئەگــەر تاکەتاکەیــەك له تێکــڕای نووســەران بەحوکمی زمانشارەزایی تێچێنێکیان له نووسینەکانیاندا کردبێو له هەلێکـدا بـه دووباره نووسیبێتیان ئەو چالاکیەی به بەرەوەنیه که پەنجەی بۆ ڕابکێشرێ• نووسەرانو ڕێنووسەوانەکان ( بەگشتی ) دەقیان بەئەوەوه گرتوه « ی » بزوێنی تیژ ، هەر بەیەك « ی » بنووسنو چاپکراوەکان لەسەر ئەوتانوپۆیه کەأەکەبوون •• ڕاستییەك هەیەو ناکرێ بەژێر لێوەوه :

فۆنەتیکیانه بنووسین ئەو بزوێنه بەدوو ڕێگەنەبێ چارناکرێ

أ ــ به دانانی چوکلەوکەشیده •

ب ــ به دووبارەکردنەوه •

ــ مەسەلەی دووباره کارێکی سەرنەگرتووەو واقیـع ئیسپاتی کـردوه ، چونکه :

ـ تەوژمو نەرمو نیانی « ی » لە زمانی کوردیداو راگەیاندنی دەیان ئەرکی رێزمانی لە ئەستۆی « ی » دا بووەتە ئەفسانە چ لە ڕێنووسدا و چ لە رێزماندا وەك تیشـکی سـەر برنجـۆك لـە هەمـوو دەرفـەتو کونوقوژبنەکەوە خۆی رادەدا !!

ـ ئەگەر لە هەموو حاڵەتێکی تیژیدا دووبارە بکرێتەوە قەڵەم زیرەی لێ‌هەڵدەستێ ، بەنموونە با سەرنجێکی ئەم دوو دێرە بدەین : « بیریی‌و ژیریی لە لادێیییێکی بێ زانستییەوە گەشە ناکاو زانینو شارەزاییـی دیاردەی شارستانییە » • تا ئێرە • لەو دوو دێڕۆکەدا بەبێ تەکەللـوف بیستو حەوت جار پیتی « ی » خۆی راداوە ، خۆ ئەگەر بێتو لەهەنـدێ رستەدا ئاوڕێك لە ئامرازی ئیزافەو راناوی کەسی ، دوەمو سێیەم بدەینەوە لەگەڵ بزوێنەکەدا ( بۆ تەعبیردانەوە لەباری رێزمانیەوە ) ئەوا شـتێکی سەمەرە بەرپادەبێ •

ـ ئەگەر « ی » تیژی بنجی بەدووبارە بنووسرێ هەرگیز ماوەنـادا کە « ی » ئیزافەو راناو بنووسرێ چونکە کەڵەکەی سێ « یـ ، ی » یـان نەزەریانە لە هەندێ باردا بە چوار « ی ، یـ » مەردومگەلەکە ملی بۆ نەناوە •

لە قەناعەتی خۆمەوە دەستبەرداری « ی » ئیزافە نەبوومو نابمو لـە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی خۆمەوە رێگەم بۆ خۆش‌کردوە :ـ

ـ دۆخی ئیزافەو وەسف ئەوەندە ساکارنین کـە فەرامۆش‌بکرێـن •• لەوبارانەدا کە بەرەنگاری بزوێنی « ی » نەبێ ئاساییانە دەنووسرێ ، وەك « خوای گەورە ، داری بەروو » •

حاڵەتی ئیزافە وەك لەسەرژمێریی هەنـدێ زانـاوە دەردەکـەوێ ، بەپێچەوانەی حاڵەتەکانی‌دی زمان هەموو سەدەیەك دوو پلە بەرزدەبێتەوەو ئەوانی‌دیکەش دێنـە خـوارەوە ، دوور نەرۆیـن هەر لە دەسـتەشێوەی

شارباژێرو موکریدا ( لەبەر گرنگی ) پاشـــکۆی « ی » لـەدوای موزاف ئیلەیەوە بەکاردەهێنن ، وەك :

« داری بەرووی ، رەئوفی ئەحمدی » لێرەدا [ ی ] دوای ئەحمەد ، کورتە بزوێنەو بۆ نیسبەت نیە •

جێی تێڕامانە کە سووربین لەسەر ئەوەی کە لە وشەی « سـیر » دا ، دووبارەی پیتێکی بنجی بکەینەوەو لە ( شینیی ئاســمان ) دا فەرامۆشـی بکەین ، وێنەی « ماسیی ، شیر » ئەگەر بەدوو [ ی ] ش نەنووسرێن هیچ تالۆزیو ئیلتیباسێك پەیداناکەن ، بەلاّم بەچیبزانـم « شـــینی ئاســمان » مەبەست شیوەنە ، یان رەنگی شینباوە ؟!

خۆ ئەگەر لەو نموونەدا سەرودەرێك بکـرێ لـەم دوو رســتەیەی بەردەمماندا جیاکارینا کرێ :

أـ دڵشادی ئێوە دەخوازم ـ

بـ دڵشادی ئێوە دەخوازم ـ

لە یەکەمیاندا مەبەست کوڕێکە کە ناوی دڵشادەو موزافە ، لەدوەمیش دا، مەبەست شادمانیو دڵشادیەو دیسان موزافە •• بەلاّم کە لەدووەمدا « ی » ئیزافەکە بنووسرێ زەین ئەوە دەقۆزێتەو کە موزافەکە « دڵشادی » یـەو « دڵشاد » نیە • کە « ی » تیژ لە گشت وشەیەکدا بەدووبارەبنووســین « ی » ئیزافەشی بخەینەپاڵ دەبێ سێ « ی » خیراخیر ریزبکرێنو ئەمـەش لەگەڵ باری واقیعدا ناگونجێو نەگونجاوە

ـ راناوی کەسی دوەمو سێیەمی تاك ، لەدوای ئەوکردارانەوە کـــە لەقەدی چاوگی یائین ؛ وەك

من مردم ، ئەو مرد ⟵ من خزیم ، ئەو خزی

« ی » کرداری خزی بنجیەو تیژەو راناو نیە

من کردم ئەو کردی ⟵ •• من زانیم ئەو زانیی •

« ی » دوای ( زانی ) دیسان بزوێنێکی درێژەو لەگۆکردندا هیــــچ جیاوازی نیە لەگەڵ « ی » خزیدا سەلیقەی زمــان بەسەر « ی » رانــاودا دەیشکێنێتەوە ، ئنجا بش‌نووسرێ : « ئەوزانی » هیچ ئاڵۆزی‌و ئیلتیباسێك پەیداناکا ••• رای گشتیش بەوە راهاتوەو بەیەك « ی » بنووسرێن ئەملایەنە خۆی ساغ‌کردوەتەوە •

بۆ کەسی دوەمیش وەك :

« من دەژیم ، تۆ دەژی • یان دەژیت » ئەگەر «ت» دووبادی = تأکیدی لەتەکدا بێ ، کێشەی لەسەر نیە ، بەڵام کەنەنووســرێ « قەناعەتــم بــەو رایەکردوە » وەك ــ ئەو زانی = زانیی ــ دیسان جوتە ( ی ی ) پێویست‌نیە •



**رایەکی تایبەتی‌و تێبینییەك :**

هەندێ زمانەوان جوتە ( یـ ، ی ) بە شێوەی بڕگە دەنووسن وەك : « هەولێریی ، سلێمانیی ، کوردیی ••• »

رای‌گشتی ( بەلای منەوە هەموو شتێك نیە ) پێش‌وازی لــێ‌نەکردوە ••• بەڵام من تقلیدیانە بۆ باری‌مەسەلەکە ناچم‌و بەڵگەیەکی زانستانەشــم بەدەســتەوەیە ••• نووســینی بڕگەیــی بــۆ یەك بزوێنــی تیژ سرکــەوێ بەباریکی‌دیکەدا خۆی ساغ کردوەتەوە ، وەك کە دەنووسێن :

( هەوایی •، بانەیی ، نانەوایی ) بەم هاوکێشەیە خۆی ساغ‌دەکاتــەوە [ دەنگ + بزوێن = بڕگە ] کە نووسرا زمانی کوردیی ــ خۆمان زەحمەت دەدەین‌و لەسەر موعادەلەکەی پێشوو دەخوێنرێتەوە : [ کورد / یی ] نەك [ کور / دیی ] بە لاتینیش بەم شێوە دەردەچن ــ **— kurdyi , kurdi**

ئەم پرسیارە لە دەرووی ئەوکەسانەدا گینگلە دەدا کە نایانەوێ خۆیان بە دەستوورەکانی زمان‌و رێزمان ببەستنەوەو تەنها بەوێنەگرتن‌و چەنــــد رەمزێك‌فێری دارشتنی‌بن‌و دەپرسن :

ئەمە بۆکێ دەلوێ لەگەڵ خێرایی نووسیندا راناوو نیشانەی ئیزافــەو پیتی بنجی لێك هەڵاوێرێ ؟

منیش ئەوەندە دەڵێم :

بۆچی دەتوانێ لە رێنووسە نافۆنەتیکیەکاندا فێری جۆرەها شتی نەزەری و سپێلی بیستەنی ببێ ، با لەکوردیشدا خۆی زەحمەتبدا یان ئەوەتا ئێمــــە جواناو دەرێژین و ئەویش ئینساف بخاتەکارو بینەوەریانــەو بیستەنیانـــە رەدووی راستی بکەوێ •

چۆن فێری نووسینی واوی جمع دەبێ بە بزوینـــی ــ ا ــ وە لـــە عەرەبیدا ، وەك کتبوا ، تا لە واوی عەتف جیابێتەوە بافێری دۆخی ئیزافــەو وەسف بێ لە کوردیشدا یان چۆن [ مسلمون ] ەو [ مسلمین ] ە بە نەزەریەی عامیل و مەعموول جیادەکاتەوە با یەكدوو لایەنی رێزمانیش فێربێ •

**ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیە :ــ**

١ــ کەشیدەی سەر ( ێ ) وەك کەشیدەی ســەر ( ۆ ) تارادەیــەك گیروگرفتکەم دەکەنەوە •• بەڵام ئەوا بۆ شەش حەوتساڵ دەچێ ــ لــە چواردیواری کۆڕی زانیاریی کورد دا قەتیس ماوە ، ئەمەش بوو بە هۆی بەکارهێنانی دوو رێنووس تەنها لە کوردستانی عێراقدا ••• ئەگەر ئــەو ماوەیە بە تاقی کردنەوە دابنێین •• دەبێ ئەو بڕیارە بەسەربکرێتەوە

یا ئەوەتا ــ کەشیدەکە لابرێ و هەندێ دەستووری کە پەیڕەوبکرێن ( وەك لەمەوبەر خرانە بەرچاو )

یان ئەوەتا شان بەشانی کــۆڕ بەڕێوەبەریەتیی خوێندنــی کــوردی و دەزگارۆشنبیریەکانی دیکەی کوردی ئەو بڕیارە لەسەرەتاوە بخەملێنـــن و ماوەی دوو ئیملا نەدرێ •

٢ــ دەتوانرێ سوود لەم دەستوورانە وەربگیردرێ :

أــ « ی » نسبەت هەمیشە داكشاوەو درێــژەو بەدوای بزوێنیشـــەوە ئینفونیكی « ي » وەردەگرێ : نانەوا + یــ + ی = نانەوایی •

ب ــ راناوی كەسی دوەمو سییـــەم بەدوای قەدی ئەوكردارانـــەدا لەچاوگی یائین بەیەك « یــ ، ی » پیشاندەدرێنو لەخۆیدا كورتەبزوێنە •

جـ ــ « ی » حاڵەتی ئیزافەو وەسف پێویستە بنووسرێنو لــە خۆیاندا بزوێنیكورتنو لەگەڵ بزوێنی « ی » دا بەجیا ، جیا ئەك بە بڕگە بنووسرێن •

دــ ی ــ لەگەڵ دەنگداردا بزوێنەو لەگەڵ بزوێندا ( كە بێجگـــەی خۆی ئاسایی بێ ) دەنگدارە •

هـ ــ «ی» بزووێنی تیژ یان داكشاو بەدووبارە كردنەوە نەسەری گرتوەو نەسەریش دەگرێ • بۆ ئەولایەنەش نموونەمان هێنایەوە •

٣ــ تەنها لاساییو سەلیقە كار مەیسەرناكا ؛ گریمان نووسەر فێـــری ئەوە بوو كە (وو) درێژو « ی ی » بە دووبارە دەنووسرێن • ئەمە بەس نیـــە لەوانەیە بەپێی ناوچەیەك یان سەدای دەنگەژێ تایبەتی‌یەكانی ئەوەی كـــە ئێمە بە درێژی دەزانینو گوێ دەكەین ئەو بە كورتی بزانێ یـــان بــــە پێچەوانەوە •• بەڵام كە زانی ( بزوێن ) چیەو لەكوێدا كورتەو لەكوێـــدا دەكشێ ، لە فەرزێكدا لاڵیش بێ جڵەوگیری دەستوورەكەدەبێ •

**نیگـــایەك :**

لە هەندێ بڕیاری تازەدا نابێ خوینەرانلێم دڵگیربن ، جونكـــــی سەركێڵیانە نەچومەتە بـــاری مەسەلەكەوەو لایەنـــی هەمـــوارو ناهەموارم خستوەتە بەرچاو و زانستانە بۆی راخزاوم ساكارانە قەڵەمم لێرانەداوەو ، خۆم خستوەتە ناخی گیروگرفتەكانـــەوە بـــە خواســـتی لێكۆلینەوەیەكـــی بەراوردانە •

[ * ــ١٠ــ وشەی کۆتایی‌هاتو بە بزوێنی ( ێ ) لەگەڵ بزوێنی‌کەدا ]

چەند نموونەیەك :ــ

هەرمێ + ان = هەرمێیان نەك ــ هەرمێیان •

ئەو هەرمێ + ە = ئەو هەرمێیە ، لەسەر دارشتنی : ( ئەو دارە ) •

شوێ + ی ــ نسبەت = شوێیی •

هەرمێ + ێك = هەرمێیێك ، باشتر :ــ

ــ هەرمێ + یەك = هەرمێیەك ــ •

لەسەرتاپای ئەو نموونانەدا ، دەردەکەوێ کە بزوێنی « ێ » ئــــەو قابلیەتەی نیە لەگەڵ بزوێنی دیکەدا بپێتەوە بە دەنگدار ، جا بۆ ترازاندنــی جووتە بزوێن ، زمانەکە خۆی چارەی دۆزیوەتەوەو ئینفۆنێکی بۆ سازاندوە ، لەهەر چوار نموونەکەدا ، کۆنسوناتی ( یــ ) جووتە بزوێنی لێکــــــدی ترازاندوە •

بەنموونە لە وشەی ( شوێ ) دا ( ناوی دێیەکە ) کە « ی » نیسبەتی بدرێتە پاڵ بۆ پارێزگاری هەردو بزوێنەکە پیتەدەنگداری « یــ » نێوبڕی کردون ، وەك ئەم هاوکێشەیە : ــ

ــ شوێ + یــ + ی = شوێیی ــ •

ئنجا هەندێ نووسەرو رێنووسەوان ئەو ئێنفۆنیکە دەکەنە سەرەتای بڕگەیەکی پساوە وەك : ( هەرمێ‌ێك ، دێ ێك ••• »

بەرای‌من پێویست بەئەو پچڕانەوەیە ناکاو بڕیاری کۆڕ کارێکی‌پەسندە لەمەسەلەی لکاندا •

بەراویزیـك :

۱ـ لەوەوبەر نیگایەکم‌دایە وشەی [ ێك ، یەك ] بەدوای بزوینـــەوە هەردوکیان کوردی واتەنین بەلام من یەك بەکاردەهینم لە زمانی ئەدەبیشدا زەقە ، لەم بارەیەوە بەراوردی وشەیەکی سەمەرەدەکەین ، کە دەبێتە هەزاپێ ، وەك وشەی :

[ لادێ + یـ + ی + یـ + ێکـ = لادێییێك ]

یان بە حیسابی ئەوانەی کە « ی » تیژ بە دووبارە دەنووسـن بــەم شێوەی لێ‌دێ :

[ لادێ + یـ + یـ ، یـ + یـ + ێکـ = لادێییێك •

بەپێی لێکۆڵینەوەکەی من تەنها چوار پیتی « یـ » کۆدەبێتەوە وەك : [ لادێییەك ]

ئەوانەی حەزیش لەبڕگە دەکەن بەم شێوانە دەی‌نووسن :ـ

[ لادێ‌یی‌یەك ، لادێیی‌یێك ، لادێ‌یی‌یێك ]

۲ـ وێنەی : ( پێ ، لێ ، تێ ، بێ ••• هتد ) ئایا دەلکێن یان‌نا ؟ لەمەولا لەگەڵ راناوی لکاوو وشەی لێکدراودا لێیان دەکۆڵمەوە •



## * ـ۱۱ـ رانــاوە لکــاوەکان چۆن بنووســرین ؟

لە رێ‌نووسی نوێدا باسی گیروگرفتەکانی راناوی لکاو نەکــراوە ، بەلام لە رێ‌نووسی کۆندا ، مامۆستا نوری عەلی ئەمین ( رابەرێ بۆ ئیملای کوردی لاپەرە ـ ٦۳ ـ ) بە شوێن ئەم باسە کەوتوە ، لەبەرئەوەکە لــە هەندێ لاوە ، رام لەگەڵیدا جیاوازە ، بەتایبەتی لەبارەی لکانو نەلکانــی دووپیتی « ی ، ێ » وە ، هەمان بابەت تێکەڵ‌کێش دەبێتەوە ، دیســان لــە

ڕێنووسی کوردیدا بڕێجار دووسەرەو بڕێجار یەکسەرە دەلکێن ۰ لـــەم بارەیشەوە بۆچوونی تایبەتیم هەیە ۰

راناو لە زمانی کوردیدا بزوکو نەسرەوتن ، بەتایبەتی لەگەل تەواوکەرو وشەی لێك دراودا ، هەندێ کەس دووسەرە ( لە بڕێ کرداردا ) دەیانلکێنن، وەك : ( دەیکرد ، بمکردایە ، بمکردایە ۰ یان ئەتکرد ، ئەتکرد ۰۰۰ هتد

**بۆ ئەم نموونانەی خوارەوە :ـ**

١ـ لە دوای کردارەوە ، دەلکێن ، وەك : ( خواستم ، خواستی ) ۰

٢ـ لەگەل تەواوکەردا ، دەلکێن بە تەواوکەرەوە ، وەك : ( هەنگم ، هەنگی لە داردا دۆزیەوە ) ۰

٣ـ لەگەل بەشی پەیوەستی وشەی لێك دراودا ، وەك : ( هەلمگرت ) دەنووسێ بە بەشی پێشەوە ، هەروەها لەگەل بەشی پەیدایی « حدثی » لەگەل کرداری یاریدەدەردا وەك : ( شیمکردەوە ، شییانکردەوە ) ۰

٤ـ بەبێ تەواوکەر دەلکێ بە دواوە کە رابووردووی سادەبێ ، وەك : ( کوشتم ، گرتتان ، گرتی ) ۰

٥ـ لەگەل رابووردووی بەردەوامیدا ، دوو رێگە لەکاردایە :ـ

أـ کە بلکێن بە کردارەکەوە ، وەك ( ئەتکرد ) ۰

ب ـ نەلکێنو لەگەل نیشانەی ( ئە = دە ) دا ، بێ ، وەك : ( ئەتکرد ، ئەم کرد ) بۆ ئەوەی دەستوورەکە لەقنەبێ ، ئەم لایەنە بە راست دەزانمو پەیڕەوی دەکەم ۰

٦ـ دیسان لەگەل نیشانەکانی داخوازیو رانەبووردووی ئیلزامیـــدا بلکێن بە نیشانەکەوە وەك : ( بیانگرە ، بمچاندایە بیچێنم ) ۰

٧ــ ئەو راناوانەی کە بۆ کەسی دوەمو سێیەمی تاکن‌و دەلکێن بــەو کردارانەوە کە کۆتایی‌ی قەدی کردارەکە بە « ی » بزوێنە ، لەگەلیــــدا جووتە نابەستن ، وەك :

ــ کڕین ــ چاوگ ــ کڕیم ، ئەو کڕی‌ی ، تۆ دەکــڕی‌ی ــ یــان ئەوان کڕی + یان = کڕییان ٠٠ هتد ٠

بۆ کەسی دوەمو سێیەمی تاك دەنووسرێ :ــ

« ئەو کڕی ، تۆ دەکڕی » لەوەوبەر هویەکەی باس‌کراوە ٠

٨ــ ئەگەر تەواوکەری کردارەکە کوتایــی بە بزوێنــی « ی » بــو دیسان راناوی کەسی سێیەم دەنووســرێ‌و چ ئەرکــی تێدانیــە ، وەك : من زەویم کڕی ، ئەو زەوی‌ی کڕی ، زەوی‌ی فروشت ، من یاریم‌کرد ، ئەو یاری‌ی‌کرد ، یاریم خۆش دەوێ ، ئەو یاری‌ی‌دکا ( بۆدۆخی بەرکــــاری لەهەندێ ئاخاوتندا ، بۆ ئەوەی ( یاری ) لە ( یار ) جیابێتــەوە ، بەچــاو ئەو میسالەوە ٠٠٠٠٠

٩ــ کە راناوی لکاو کەوتە نێوان دوو نیشانەوە ، وەك ئامرازی نەفی‌و نیشانەی رانەبووردوو و ڕابووردووی دوور دوو ڕا هەیە ، یەکەمیــان رای ئەنجومەنــی کــۆڕی زانیاریــە ، کــە راناوەکــە دەلکێنێ بــە نیشانەی رابووردوەکەوە من ئەم لایەنە پەســندناکەم ؛ بۆ ئەوەی‌کــە دەســتووره گشتیەکە تێك‌نەچێ ، ئەوان دەنووسن : « نەمدەدین ، نەیــدەدی » یــان ــ نایبینم ، ناتبینم ٠٠٠ هتد ٠

من دەنووسم : ( نەم دەدین ، نەی دەدی ، نەمدی ، نەی‌دی ٠٠٠ هتد ٠

ئەنجـامی بەراوردەکە :

١ـ راناوی لکاو یەك سەرە ، نەك دووسەرە دەلکێن بەپێش خۆیانەوە ، وەك : « بزنم سەربڕی ، سەرم بڕی ، بڕیم » •

٢ـ پیتی « ی ، ێ » حیسابی لکاویان بۆ بکرێ ، وەك ( گوێیان لێ بوو )•

٣ـ دابین کردنی راناوی لکاو بە پێی شوێن ، زەین کاریەکی باشـــی دەوێ ، بەچاو ئەو کەسانەوە کە دالـێزای ناوچەی زمانەئەدەبیەکەن سەلیقـە یارمەتییان دەدا بەڵام بۆ کەسانی دی ، بەبێ دالدەی رێزمان تووشـــــی بەکارهێنانی هەڵەدەبن •



## ✱ ـ١٢ـ گیروگرفتەکانـی وشـەی لێـکدراو

ئەگەر تائێستا تارادەیەك زاڵ بووبین بەسەر تەگەرەی نووسینی بێجگەی وشەیَ لێك دراودا ئەم بابەتەیان هەروەها بەئاڵۆزی ماوەتەوە ، لە بێنەوبەرەی نووسینی هەمەشێوەدایە ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە تائێستا لەتۆژینـــەوەی رێزماندا جۆرەکانی لێك دراو ساغ نەکراونەوە چ لەرووی وشەسازییەوە و چ لەرووی رێنووسەوە •

لەباوەڕی مندا لێك دراو بڕبڕەپشتی زمانەکەمانە ، وەك موعجیزەیەك سەیری دەکەم •• شاشەیەکی ئەفسوونیەو مێژووی دێرینی تێدا دەورنگیتەوە •• چیرۆك و داستانە ••• گەردبینـە ئامێرێکـی تۆمارگـەرو وێنەگـرە ، پارچەکانی وشەی لێك دراو هەر یەکەیان دوگمەی دینەمۆیەکی گیان بەخشی

جاویدانیه •• هەر ئەوەندەم لەدەستدێ •• کە لەئاقار مەزنایەتیی وشەی لێکدراودا بە چۆکدابێم •• لەمەیدانی بێدەربەستیماندا شەرمەزارانە ملکەچبم ••• دەستمایەی دەوڵەمەندیی زمانی کوردی ـ ئەوەندەی خواحەزبکا ـ وشەی لێکدراوە ، کە بیگەیەنێتە چڵە بۆپەی هێزوپێز ، بۆ هیچ زاراوەیەکی زانستیو ئەدەبی دۆش دانەمێنین ••• لەژێر پەردەی ڕێنووسدا بۆم نالوێ مەودایبدەمێ •• بەکورتی ئەوەندی ناسکو گرنگە پتر بێنازە لەمەیدانی زمانەوانیماندا !!



## ١ ـ نووسینی وشەی داڕێژراو :

ئەو بەشەوشەن کە بەپاش‌گرو پێش‌گری تایبەتی دروستدەبن بۆ مەبەستی نوێ ، ئەومۆرفێمەی کە دەکەوێتە گەڵ وشە سەرەکیەکە ، سەربەخۆیانە مەبەست ناگەیەنێ یان هەربەکاریش ناهێنرێ ، جا بەهۆی سوانەوەوەبێ یان لەبنەرەتدا وەهابێ ، بەخواستی ڕێنووس نەك کرۆکزانیی زمان برێکیان لێدەخەمە بەرچاو :

| پاشگر | وشەی دارێژراو |
| --- | --- |
| ١ـ ە | بست ـ بستە |
| ٢ـ ەك | كورت ـ كورتەك |
| ٣ـ ۆك | ئارام ـ ئارامۆك |
| ٤ـ ك | دەست ـ دەسك ـ (ik) |
| ٥ـ ۆڵە | چنگ ـ چنگۆڵە |
| ٦ـ یلە | كار ـ كاریلە |
| ٧ـ ولە | مێش ـ مێشوولە |
| ٨ـ چە | باخ ـ باخچە |
| ٩ـ ۆچكە | منداڵ ـ منداڵۆچكە |
| ١٠ـ گا ، گە | كۆ ... ـ كۆگا |
| ١١ـ دان | خوێ ـ خوێدان |
| ١٢ـ ستان | كورد ـ كوردستان |
| = = | گوڵ ـ گولستان |
| ١٣ـ ێن | هەلووك ـ هەلووكێن |
| ١٤ـ ێنە | ماش ـ ماشێنە |
| ١٥ـ دار | ماڵ ـ ماڵدار |
| ١٦ـ گەر | مس ـ مسگەر |
| ١٧ـ یار | نووس ـ نووسیار ( كاتب ) . |
| ١٨ـ ین | ئاگر ـ ئاگرین |

ئەم وشە دارێژراوانە ، بە بێدەمەقاڵێ بەیەکەوە دەنووسرێن ، چونکــە ئەو مۆرفێمانە بەتەنێ سەربەخۆ نین‌و لەکاتی دارشتنندا ئەرکێکی ڕێزمانــی دەبینن ، ئێرەش جێگەی ئەوە نیە کە باسی ئەرکی تێدابکرێ •



۲ ـ وشەی تێکشکاو ــو سواوە(۸)

ئەو وشە لێکدراوانەن کە پێك‌هاتوون لە بەشێکی سەرکی‌و بەشێکی پەیوەست یان لە چەند بەشێك ، بە سواوەیی و تێك‌شـــکاوی ، جــا ئامراز بن یان نا ، ئەم بەشەیان لێ‌وپۆپی زۆرە کورتەیەکیــان لێ‌دەخەمــە ڕوو بۆ مەبەستی ڕێنووس

اـ ئامرازی لێکدراو :

ـ لێك ـــــ لەیەك : لێك‌چوون •

ـ تیا = تێدا ـــ : هیچی تیدانیە •

ـ وێکرا = بەیەکەوە ، پێکرا ••••

ـ پێرا = پێیەوە : •••••

ـ کولۆجێ = کل ّ وجــە

کە ئەپسێنەوە بەیەکەوە دەلکێن ، وەك هیچی تێدانیە بە پساوەییش ، وەك تێیاندا •

---

(۸) ئەوانەی کە دەنووسن : « داتاشراو = منحوت » پتر بۆ « مشـــــتق » بەکارەو سەربەگەردانە •

**ب ـ راناوی ئیشاری لەگەڵ هەندێ ناوەڵ کرداردا :**

وەك : ( ئەمشەو ، ئەمساڵ ، ئیمڕۆ ٠٠٠٠ هتد ) راناوەئیشاریەکـــــە ئەرکیسەرکی لە ناورستەدا ، دۆڕاندوەو پتر دەوری ئامرازی شونـــاس دەبینێ ئەو وشانە جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەم رستانەی خوارەوەدا : ـ

« ئەم سالە ـ سالێکی نەهاتە ، ئەم سالە نەهاتە دوایی نەهات ، ئـەم شەوە زۆر تاریکە »

کەواتە وێنەی « ئیمشەو » بەیەکەوە دەنووسرێن ، بێجگە لـەوەش کە سواوەتەوە کوردینووسان بەو شێوە لکانە راهاتونو بیانووش لـــە گۆڕیدایە کە راناوە ئیشاریەکە ئەرکەسەرکیەکەی تێو رستەسازی نابینـێ

**[ ج وشەی تێکشکاو ]**

أـ لەیەك سەرەوە ، وەك :

ـ زستان = زمستان = زوقم + ستان ـ

ـ زەیستان = زان ، زایین + ستان : کاتی زان •

ـ کوێستان = کۆ ، کوهـ + ستان : شوێنی کێو ، وشەی « ســتان » سەنسکریتیەو بەواتای کاتو شوێن دەورێکی ســەرەکی هەیـــە لەکوردیو فارسیو هیندیدا • ئەگەر لـە بنجیش / دا ، ســـەربەخۆ بووبێ ، ئێستا لە بەکارهێنانی ئێمەدا ، سەربەخۆ نیەو دەلکێ •

ـ گورگاسا = گورگ + ئاسا : بە سوانەوەی هەمزە •

ـ دالاش = داڵ + واشە ، مریشك = مری ئیشك = وشك ٠٠٠٠

**٢ــ لەدووســەرەوە ، وەك :**

ــ  خورمژ = خورماو مێوژ ، لەدوولاوە تێكشکاوە

ــ  دەسار = دەستاڕ = دەست + هاڕ ــ

پوختەی قسە ئەوەیە کە ئەو جۆرە وشانە بەیەکەوە بنووسرێن : چونکە فۆرمەکە بریتیە لە گوژمەیەکی بەسەریەکدا جۆشدراو •



**٣ــ وشەی لێکدراو بەهۆی ئامرازی بەستنەوەوە « حرف عطف(٩) » وەك :!**

ــ  کوتومت ، پڕوپاگاندە ، مشتومڕ ، گفتوگو ــ بڕیاری کۆڕ لەو بارەیەوە کارێکی بەجێیە ؛ چونکە لەقالبی یەك وشەیی‌دانو ســەر بەگەردانـــین و ئامرازەکـــەش ( هاوبەشـــی لەحوکمـــدا ) ناگەیەنــێو زوربــــەی دوو پارچەبەستراوەکان بەجیا جیا مەبەست ناگەیەنن‌و بۆ ئەوەی لەرکێفــــــی رستەسازی دەربازبین بەیەکەوە نووســـینی پارچـــەی پێشـــەوە لەگـەڵ ئامرازەکەدا کارێکی ژیرانەیە •• بەڵام : دەبێ نووسەر لە کەینوبەینــــــــی ئامرازی بەستنەوە بەئاگابێ‌و هەست بەو مامەڵەیەبکا !

---

(٩)  نیگایەك :ــ لە نووسینی بەرهەمەکانی ئەم دواییەمدا « وە » ی بڕگـەم بەکارنەهێناوە :ــ

١ــ بۆم دەرکەوتوە کە بەتاوی عەرەبی خۆی کوتاوەتە کوردیەوە . واوی ئیبتیدایی لە زمانەکەماندا ناسازە .

٢ــ ئەو نووســەرانەی‌کە بەکاری‌دەهێنن یان بەکاریگەری‌ی عەرەبیەکەیە . یان لە جۆشدانی بەندو رستەی کوردیدا بێ‌دەسەڵاتن .

### ٤ـ وشەی جووتەنی :

هەندێ کەس دەنووسن : ( جووتەناو ) •• ئەو لێدانەوەیە بەرتەسکەو بەتایبەتی بۆ ئەم شوێنە • مەرج نیە تەنها لە دوو نـاو پێك بێن ، وەك : ( بەم ــ بەم ، هەی ــ هەی ) یان لە چەند توخمێکیدی ، وەك :

( زەنا ــ زەنا ، سووك ــ سووك ، زەق ــ زەق )

ئەم بابەتە وشانە ( جووتەنی ) بەیەکەوە نانووسرێن ؛ چونکە بـــۆ دوبادیو تأکیدی حالەتن• بیتو بنووسرێ : (زقزەق ، سووکسووك) خاسیەتەکە لەکیس دەچێ ، باری دەربڕینو شـوێن بەرەو یەك وشـەیی باناداتـەوە • بێجگە لەوەش رێنووسەکەمان دەقی بەئەوەوە گرتـوە کـە بەجیاجیـا بنووسـرێن ؛ لەگـەڵ ئەوەدانیـم کـە شـتێك هەڵـە نەبێو بچەسپێ دەستکاریبکرێ •



### ٥ـ ئەو وشەلێکدراوانەی کە لە چەند بەشێکی تەواو پێکهاتون ، بەمەرجـێ لە خێڵی کردار نەبن

نموونەی ئەو بابەتەمان وەك : [ دڵشاد ، دڵسۆز ، گوڵناز ، سۆسنخاڵ گەردنگەش ، چاپخانە ، گۆیدرێژ ••• ]

لێرەدا سێ رای دوورو نزیك دەخمە بەرچاو :ــ

١ــ هەموویان بەسەریەکەوە بنووسرێن •

٢ــ هەموویان بە جیاجیا بنووسرێن •

٣ـ ئەگەر دیارناو « علم » بوون ، یان ناوی پیشەو شــوێن بوون ، یان وشەی فەرهەنگی بوون ، ئەوا بەسەریەکەوە بنووســرێن ، ئەگینــا بەجیا ــ جیا بنووسرێن •

رای سێیەم بڕیاری کۆڕەو بەم نموونەیە مەبەستیان راڤەدەکەن :

ئەگەر بۆ نموونە وشەی « دلسۆز » دیارناوبێ بەسەریەکەوە بنووسرێ وەك : ( دڵسۆزی خۆشکم ) ئەگەر ئاوەڵ ناوبێ « صفة » بەجیــا ، جیــا بنووسرێ وەك پیاوی ــ دڵسۆز ــ خۆشەویستە •

من لێرەدا رام جیاوازە ؛ هیچ نووسەرێك لەگەرمەی نووسیندا ئــەو مەلەکەیەی بۆ پەیدا نابێو ئەوەندە زەین تیژنیە کە لەم رستەیەی خــوارەوەدا سەری لێ تێك نەچێ :

« دلسۆز بە دڵسۆزی ئیش دەکا » • بە حیسابی ئەوەی کە لەیەکەمیاندا دیارناوەو بە یەکەوە بنووسرێو لەدوەمیاندا ئاوەڵناوەو بەجیا ــ جیــا بنووسرێ •

دیسان وشەی فەرهەنگی هەر چیەبێ کە بووبەسەرباس‌و سەربەنــد دیارناوێکە بۆخۆی دەبی بەبێ ریزپەڕ هەموویان لەســەرەوە بەیەکــەوە بنووسرێن‌و کە دەگاتەسەر راڤە لێك هەڵبوەشێنەوە ، وەك لــەم نموونانەدا ( پێلێهەڵبڕین ، شوڵلێهەڵکێشان ) ئنجــا لــە راڤەکــەدا ، دەنووســرێ‌و هەڵدەوەشێتەوە : ( هۆمەر پیاوێکی پێ‌لێ‌هەڵبڕە : زیدەرۆیە • )

ئەم رای لەمەڕ ئێرە بەنەزەریەکی رووت دادەنێم ، حەوت ئەوەنــدە سفتی‌و کەم‌ئەرکی پاڵمانپێوەبنــێ ئەوکارە نەسەری گرتــووەو نە سەریش دەگرێ •

بەرلەوەی‌کە بڕیــاری خــۆم دەربــڕم ئەوەنــدە فێربــووم : کــە وشەی‌لێك‌دراو لــە رووی واتاوە لــە حوکمــی ســادەدایە ، کە دەڵێی :

« میرگەسوور » واتای سوری بۆ میرگی سەوز فەراموش‌کراوەو نــــاوی تاقە ناوچەیەکە ئەوەشمان لەبیرناباتەوە کە سەبارەتێك هەیە بۆ دابەزینـــی ئەو وشە دژوارە ؛ چونکە خاسیەتی مێرگ هەمیشە سەوزیە • لــــەرووی ئیتمۆلۆژیەوە کنە لەو بابەتەوشانەدا دەکرێ •

بیانووی هەرەمەزن ئەوەیە کە وشەی لێــكدراو لەحوکمــی وشــەی سادەدایەو کەخرایە قاڵبی لیكدراویەوە بەسفتی بەیەکەوەلکان زەینمــــان بۆ پارچەکانی‌و سەر بەخوییان ناترازێ • لەمانە بەئاگام بەڵام وەختێـــك داری ئەو خۆزگەیە بەردەگــرێ کە هەموو وشــەیەکی لێــكدراو ، وەك « دڵسۆزو ــ گوڵناز » بوونایە !!

ئەم پرسیارە : بۆچی سڵ‌ناکەینــەوە لــە پچڕپچــڕیی ئەم وشــــە لێكدراوانەی خوارەوە کــە هیــچ هێزێــك لەحیمیان‌ناکاو مەبەستیشـیان نەدۆڕاندوە ؟! •••• وەك :ــ

[ سەرچل ، بەرچنە ، گوڵەباخ ، پیرەمێــرد ، شــارەزور ، هەواکێــــش ، سەماکەرە ، فیلەگێژە ، ســواراغا ، ســەرباز ، بنەمــا ، راوەنگویــــن ، سەراپەردە ، خەندەلێو •••• هتد ]

ئەمە واو کەچی کە نووسیمان :

[ گوڵ‌ناز ، گوڵ خەندەران ، چاپ‌خانە ]

ئەوا مەبەست‌و شکڵ نوێ تەخت‌وتاراجیان تێك‌دەچی ؟!

من بەش‌بەخۆم هەروەك ئەو مەردومگەلە بەلەقی‌و هەموچیزە وشــەی لێك‌دراوم نووسیوە ، ناچاریش بووم ؛ چونکە وەك خاوەن ڕا بەرهەمم لــە رێ‌نووسەوانیدا پێش‌کەش نەکردوە • لە ئەنجامی بەراوردو تاقی‌کردنەوەدا دوابڕیارم لەم بەحسەدا تەقاندەوە •

بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان •••

واقیع ئیسپاتی‌دەکا کە ئەو جۆرە وشە لێك دراوانە بەلکاوی‌و بەیەکەوە نووسراو هیچ دەستورێك دابینیان ناکاو چار هەر ئەوەیەکە بەسەریەکـەوە نەنووسرێن • ئەگەر بەلگەش ئەوە بێ کە لەفارسی‌و عەرەبیدا وشـــــەی لێکدراوبەسەر یەکەوە دەنووسن ، جارێ عەرەب بە تاوی‌زمانی‌دی وشـــەی لێکدراو کەم تابێژێك کەوتوەتە زمانەکەیانەوە ئەو دیاردەیە لە تایەتـــی زمانی ئەوان‌نیە و بیجگە لەوەش چ ئەوان‌و چ فارسەکان رێنووسەکەیـان ناتەواوەو پشت بەبزوێن نووسین نابەستن •

بەلگەیەکی دیکەی ژیربێژیانە بۆ پێـوە ـ نەنووسـانی لێـكدراوی پارچە تەواو :

وشەی لێکدراو لەخۆیدا لێدانەوەیەکی کورتـی ئەندازیارانەیـــەو جوتێتی‌ی دابەزینەکەی راڤـەدەکاتەوە ؛ کە نووسـیمان : ( دڵشـــاد ) سەرنج‌رادەکێشـی بۆ فۆرم‌و قەبـارەی ئەو شـتە کە بەوشـەی « دڵ » دەردەبڕدرێ ، بۆ لێوردبوونەوەی وشەی « شاد » ئنجا پەیوەندی ئـــەم دوانەو سازدانی وشەنوێیەکە بۆ مەبەستی تازە کە ، کەسێکە ناودێرە بـــە شادمانی‌و دڵخۆشی‌و ئاسوودەیی‌ی دەروونی •

ئەم نیمچەچیرۆکە لە تاکە ـ تاکەی وشەکانەوە هەڵدەستێ‌و ئەوەشت لەبیرناباتەوە کە مەبەستت تاکە ، کەسێکی ناودێرە بە هەمان جووتەوشـەی بەسەریەکەوە لەو نموونەیەدا



**لێکدراو لە وشەو کار ، کە وشەکە ئامرازو پێش‌گرنەبێ ، وەك :ــ**

ــ ناو + کار : دەست‌گرتن ، سەردان ، حەج‌کردن ، جەرگ‌بڕ ٠

ــ ئاوەڵکار + کار : لاکردنەوە ، تێوبڕ ، پشت‌دانەوە ، پاڵ‌خستن ، لامێژ ٠

سیفە + کردار :ــ

( چاك‌کردن ، مان‌گرتن ، مایین‌بەز ، شی‌کردنەوە ٠

ئەم جۆرەلێکدراوانە تا ئێستا هیچ زمانەوان‌و ڕێ‌نووسەوانێك بە یەك جوون نەی‌نووسیون ٠

هەروەها بە لەقی‌و ئاڵۆزکاوی لە هێنان‌و بردن‌دان

راستییەك هەیەو بۆ یەکەم جار دەی‌درکێنم باری ڕەوان‌بێژی ( کـــە کالآی زمانە ) کەتنێکی باشی بۆ ناوینەوە لە ڕێ‌نووسی کوردیداو لــــە ڕێ‌زماندا چونکە ئەوەندەی لە ئاوێنەی زمانی دەرەکیەوە سەیری فەســاڵی وشەی لێکدراودەکەین لەخودی روخسارەکەی خۆیان وردنابینەوە ٠٠

کە دەنووسرێ «پێش‌کەوتن» بە بالآی «تقدم»ی سادە ، دەردەبڕری ، یان ( چـــاك + کـــردن ) بە ( اصـــلاح ) ، ( شی‌کردنـــەوە ) بە ( تحلیـــل ) پەنجەکێش‌دەکەین ، بە تێ‌ڕامانی لایەنە خوازە کاریەکە ، واتای بەرایـــی «لغوی» کە بنیادی شکڵ‌نوسی وشەی لەسەردەکرێ لە زەینی نووسەرەکەدا فەرامۆش دەبێ ٠٠٠ دەمێکە هەستم بە ئەوە کردوەو باری دەروونـــیی خۆیشم لەو کاری گەربوونە نەخەلستوە ٠

وتمان بەیەکەوە نوسینی ئەو جۆرەوشانە بەهیچ جۆر ســەرناگری ؛ گریمان نووسیمان : « چاککردنەوە » و بەیەکـــەوە جۆشـــماندا ، دوای تۆزێ لە گەرداندا هەڵدەوەشێتەوە ، وەك : « چاکی‌کرد ، چاکیان‌کـــرد ، چاکت‌نەکرد ٠٠٠٠٠ »



**[ گیروگرفتەکانی کـرداری لێـکدراو ]**

أـ کرداری لێکدراو یەکێکە لەو بابەتە وشانەی کە بەخەسـتی باوەشێك تەگەرەی رەگەڵ خۆی خستوەو لەنێوان چەندان رای جوداوازدا گێژدەخواو بەئاڵۆزی لەم نووسینو نووسیندا ماوەتەوە • تـا ئێسـتا هیچ نووسەرێك بارێکی یەکسانی تێدا رەچاو نەکردوە •

**١ـ کرداری لێکدراو لەبەشی پەیدایی‌و پێش‌گر :**

أـ هەڵ + کێشان ، هەڵنەکێشان ، هەڵبکێشە •••••

بـ دا ، ڕا ، رۆ + ••• وەك : داپەڕین ، ڕاپەڕین ، رۆچوو •••
بەشی « ب » لە خۆیدا نەلکاوە •

جـ پریپوزیشنی ( لێ ، پێ ، تـێ ، بە ، جـێ ، ) وەك : [ لێخوڕیـن ، لێمانخوڕە ، پێ‌گوتن ، پێم‌گوت ، تێ‌کەوتن ، تێی‌کەوت ، بەجی‌مـا ، بەجێ‌نەما •••• ] •

دـ ئاوەڵکار + پریپۆزیشن + کردار ، وەك : [ رێ‌تێ‌چوون ، رێی‌تێ‌دەچێ ، رووڵێ‌نان ، ڕوومانڵێی‌نا •• ] •

سەرەرای ئەوەکە پرێپۆزیشن توخمێکی سەربەخۆیە ئەگەر لەگـەڵ چاوکەکاندا بشلکێن ، لە پرێکداو لەدۆخی گەردانـدا هەڵدەوەشـێنەوە ، وەك : [ رێتێچون ، رێی‌تێ‌ناچێ ]

هـ ـ یان کردارەکە پێك‌بێ لە چەند پریپوزیشن‌و پێش‌گرێك ، وەك :
[ پێ‌لێ‌هەڵبڕین ] تەنها ئەم کردارە لەنێوان پێنج‌شێوە ئیملادا لەگیروگازدایە، هیچ دەستوورێك ناتوانێ یەك شێوەی بۆ دابین‌بکا بێجگـە لەوەی کـە بەسەریەکەوە نەنووسرێ •



[ ٢ـ كردار + نيشـانه : ]

وەك [ هات + وه = هاتوه ، هاتگه ] • زۆر له زمانەوانان دەنووسن : ( هاتووه ) به دوو واو ، ئەمەش به هەڵەدەزانم ، چونكه نيشانەكه تەنهـا بريتيه له ( وه ) وەك له ( زانى + وه ) دا • وەك له شوێنى خۆيدا باسكـرا نيمچەژێرو بۆر له ئيملاى سەر بەعەرەبيدا نانووسرێن بەو بۆچونەبێ دەبـێ بەلاى كەمەوه له : ( بوو + وه ) دا بنووسرێ ( بوووه ) !!



٣ـ كردار + پاشگر ـ

وەك : ( هات + ەوه = هاتەوه )

گيروگرفتى تێدانيه ، بەڵام لەو كردارانەدا كه كۆتاييان بـه ( وو ) ى درێژه ، هەڵەى تێدا كراوه ، وەك ( بوو + ەوه = بوەوه ) كەچێ دەنووسن : ( بۆوه ) ئەگەر له زمانى قسەدا دروستبێ بۆ زمانى نووسـين هەڵەيـه • بزوێنى « ه » بزوێنى « وو » دەكاتەوه به دەنگدارو دەنووسرێ [ بوەوه ] •

٤ ـ كردار + نيشـانه + ئێنفۆنيـك + پـاشگر :

[ هات + وه + ت + ەوه = هاتوەتەوه ]
كەچى به هەڵه دەنووسن [ هاتۆتەوه ] •



[ پوجتـەی بـەراورد ]

أ- بەبێ کیشە ئەم وشانە بەیەکەوە دەنووسرێن

١- وشەی دارێژراو : ( گولستان ، کلدان )

٢- وشەی تێکشکاو : ( خورمژ ، زەیستان ) ،

٣- ئامرازی سواوە : ( لێك ، پێك ، تیا ، تێدا ، پێکرا ، تێکرا ... )

٤- وشەی لێـکدراو بەهـۆی ئامـرازی بەسـتنەوەوە بەیەکـەوە دەنووسرێن :

( مشتومڕ ، قەپوقر ، گفتوگۆ ، چەندوچوون .. )

ب - ئەم وشە لێکدراوانە بەسەر یەکەوە نانووسرێن :

١- پێکهاتو لە دوو بەشی سەربەخۆ : [ کەڵخەس ، دڵسـۆز ، جوانڕۆ ، ڕێزمان ، ڕێنووس ... ]

٢- پێکهاتو لە ناو ، سیفەت + کردار :

[ دەستبڕ ، لێچوون ، پێلێهەڵبڕین ] .

٤- بە هۆی ئامرازی نەفی :

[ بێگەرد ، بێخاڵ ، بێدڵ ... وەك نالەبار ، ناساز ]

٥- وشەی جووتەنی :

[ زەق‌زەق هەی ، هەی ، سووك‌سووك ٠٠ ]

لەو ڕێگایانەوە نەبێ هیچ نووسەرێکی بلیمەت ناتوانێ بەیەکسانی وشەی لێك‌دراو بنووسێ‌و تاقی‌کردنەوەی ساڵەهای ساڵ‌و باری زانستانەو ژیربێژیانە باشترین بەڵگەن بۆسەلماندنی قسەکانم و بڕیارەکانم ٠

[ بەسەرکردنەوەیەت ]

ئایا دەتوانین هەمو وشەو مۆرفیمێکی سواوەو تێك‌شکاو بگێڕینەوە بۆ دۆخی بنجی‌ی خۆی ؟!٠٠٠

وەڵام : بەگشتی نەخێر ٠٠٠ ئەوەیش دەگێڕدرێتەوە نابێ لە کوردی‌واتەنی‌و یاسای راهاتن‌و زانست بچێتە دەرەوە ، دوو نموونە دەهێنمەوە :ــ

١ ــ ئەو وشانەی بەساڵەها سواونەوەو لەرکێنفی گەڕانەوەدانین ، وەك :

ــ زستان ، زمستان ــ نابنەوە بە ــ زوقم‌ستان ــ

ــ گەرچەك ــ نایێتەوە ــ بە ــ گەڕچاك ــ

ــ ئەمشەو ــ نایێتەوە ــ ئەم شەوە ــ ٠

٢ــ لەگەڵ ئەوەشدا بە رادەیەکی ماقوول تەکانی‌بۆدەدرێ وەك :

| بنووســــه | مەنووســــه |
|---|---|
| تێــــدا | تیــا |
| کاربکــه | کارکــه |
| لەمــاڵدا | لــەمــاڵا |
| بێدەرێ | بێیەرێ |
| دوازده ، سیزده ••• | دوانزه ، دوانگزه ، سیانزه |
| لاپەڕە | روپــەل |
| بــووك | بیــــوك |
| کێرد ( چەقوێ گەوره ) | کێر ( وەك لە کرمانجیی سەروودا ) |
| دەهێنــی | دێنــــێ |
| لــەمــاڵ | لمــــاڵ |
| کـــردن | کـــرن • |
| خوا ، خودا | خـــدا • |

## [ فەرهەنگۆك ]

« ا »

| | |
|---|---|
| ئەمپەڕاوپەر | ـ: البداية والنهاية • |
| ئامێر | ـ: آلة • |
| ئامرازی بەستنەوە | ـ: حرف العطف • |
| ئامرازی پەیوەندی | ـ: اداة الربط • |
| ئەندازیارانە | ـ: الهندسية • |
| ئاسایی | ـ: اعتيادي • |
| ئامادەیی | ـ: إعدادي • |
| ئەنجام | ـ: تتيجة • |
| ئالۆز | ـ: معقد • |
| ئالۆزەزمانی | ـ: ملابسات لغوية • |
| ئاوەڵناو | ـ: صفة • |
| ئاوەڵناوی کارا | ـ: اسم فاعل • |
| ئاوەڵناوی بەرکار | ـ: اسم مفعول • |
| ئاوەڵکار ، ئاوەڵکردار | ـ: ظرف الزمان او المكان • |
| ئیدی ، دی | ـ: ئیتر ، تر ، کە بۆ بەراوردی سیفەنەبن راسترە • |
| ئەرك | ـ: وظيفة • |
| ئەنجومەن | ـ: مجلس • |
| ئەندێشە | ـ: خەیاڵ • |
| ئاژاوە | ـ: فوضى • |

*

« ب »

بنیاد — بناغه دانان ، نه‌ك ( بنیات ) له‌سه‌ر ئاهه‌نگی عه‌ره‌بی •

به‌رهه‌می ئه‌ده‌بی :ـ النتاج الادبی •

بین گرتن :ـ چه‌ق گرتن ، ترکیز •

به‌ند ، :ـ فقرة •

به‌ندی راگه‌یاندن :ـ ـ فقرة إعلانیة •

به‌رنه‌فه‌سانه :ـ به‌رفراوان و راسته‌وراست •

برگه :ـ مقطع صوتي •

به‌سه‌رکردنه‌وه :ـ استدراك ، له‌سه‌رژمیری ی ئاژه‌ڵه‌وه هاتوه •

بۆر ( حرکة ) :ـ الضمة •

به‌کرده‌وه :ـ به ( عملي ) •

بیرته‌سك :ـ ضیق التفکیر •

به‌رکه‌نار :ـ منعزل •

بیسته‌نی :ـ سماعي •

بیانوو :ـ ـ حجة •

بیانووبڕ :ـ ـ برهان قاطع •

بار ، باره :ـ دۆخ ، حاڵه‌ت •

به‌سه‌رجه‌می :ـ به ( عمومي ) •

بنکه :ـ قاعدة •

باره‌ده‌روونیه‌کان :ـ الحالات النفسیة •

به‌رایی :ـ بدائي •

په‌ده‌گمه‌ن :ـ شاذ •

| | |
|---|---|
| بەشیپەیوەستی | :ـ الجزء التركيبي • |
| بەشی پەیدایی | :ـ الجزء الحدثي • |
| بەلگــــە | :ـ دلیــل • |
| بڕ ، بڕێــك | :ـ هەندێ ، بعض • |
| بەرکــار | :ـ مفعــول • |
| بەرکــاری | :ـ المفعولیــة • |
| بەکــار | :ـ فعـــال • |
| بەندەفۆنیــم | :ـ ئەو بزوێنەیەکــە دەکەوێتــە نێــوان دوو دەنگەوە بۆ رەهاکردنیان • |
| بینــەوەریانە | :ـ هەڵسەنگاندنی شت ، تەنهــا بە هــوی بینینو چاوتێهەڵەنگووتنەوە • |
| بەرتەســك | :ـ بێمەوداو نافراوان • |
| بــەراورد | :ـ مقــارنة • |
| بزوێــن | :ـ حركــة • |
| بەرەنجــامی | :ـ اســتقرائي • |
| باشیوناباشی | :ـ ایجابي وسلبي • |
| بەرهەڵســت | :ـ مانــع • |
| برنجــۆك | :ـ کرێشەیەکی کونکونی شاشە • |
| بڕیــار | :ـ قـــرار • |
| بەجێهێنــان | :ـ تنفیـــذ • |
| بنجـــی | :ـ ئەسڵی • لە ( بنك ) ەوە هاتوە • |



« پ »

| | |
|---|---|
| پــاكزاد | :ـ نجيـب • |
| پەرۆش | :ـ شـغف ، شدة الاشتياق • |
| پەيـڕەو | :ـ اتبــاع • |
| پێـــودان | :ـ ( نمط ) له ـ دانو پێ ـ ی ئاشـــەوە وەرگیراوە ، بەخوازەکاری • |
| پچـڕپچـڕ | :ـ متقطـع • |
| پێـكهێنــان | :ـ تكـوين • |
| پێـكهاتــن | :ـ تكـوّن • |
| پرپیۆزیشــن | :ـ حـروف جـرّ • |
| پیتــەدەنگدارەكــان | :ـ الحروف الصوتية « الصحيحة » • |
| پەراوێـــز | :ـ حاشـية ، تعليق • |
| پوختەی پەراورد | :ـ خلاصة المقارنة • |



« ت »

| | |
|---|---|
| تەريـب | :ـ كورتەهێلی پۆپی ( ـــ ) • |
| تـــاو | :ـ تأثـير • |
| تێچـڕاندن | :ـ پڕکردنو تێپەســتاوتن • |
| تەگـــەرە | :ـ عـرقلة • |
| تايبەتـی | :ـ خصوصـي • |
| تايبەتەكـــان | :ـ الخصــائص • |

| | |
|---|---|
| تەکـانـدەر | :ــ نفـاثة • |
| تاسـەل | :ــ تیـر • |
| تیـپ | :ــ دەستە ، پۆل ، کۆمەڵ ، لەشکر • |
| تیپخوازان | :ــ ئەوانەی وشەی « تیپ » بـۆ « حـرف » بەکاردەهێنن • |
| تازەئاخاوتـن | :ــ قسەی تازەپەیدابوو • |
| تێکـڕا | :ــ معـدل • |
| تەواوکـەر | :ــ التکمـلة • |
| تێکشـکاو | :ــ منکسر و منحـوت • |
| تاشراو ، داتاشـراو | :ــ مشـتق • |
| تێ‌رامـان | :ــ بەسەرسوڕمانەوە سەیرکردن • |
| تۆژینـەوە | :ــ کۆلینەوەو یەکالاکردن • |
| توخـم | :ــ عنصـر • |

« ج »

| | |
|---|---|
| جغـز | :ــ مـدار • |
| جەوهـەر | :ــ گەوهەر ، ئەمیان نجیبە • |
| جیاکـاری | :ــ تمییـز • |
| جیاکەرەوەکـان | :ــ الممیـزات • |
| جەرگـە | :ــ صـمیم ، ناوەند • |
| جەلەکـردن | :ــ تێکبەستن بەریز • |
| جووتەنـی | :ــ الزوجیـة • |

« چ »

| | |
|---|---|
| چەندوچوون | :ــ مناقشة ، واتە : لێیدوان لە ئەبعادی شت • |
| چەشەبوون | :ــ تذوق • |
| چاوگ | :ــ مصدر الافعال • |
| چرووسان | :ــ لەگەشە وەستان • |
| چرووساندن | :ــ لەگەشە وەستاندن • |



« ح »

| | |
|---|---|
| حینجە | :ــ التهجي • |
| حالەت | :ــ بارە ، دۆخ • |
| حەلێب | :ــ حیسابی ، قبووڵکراو • |
| حەلێك | :ــ جەلێك ، کاتێك • |



« خ »

| | |
|---|---|
| خودپەسندی | :ــ حب الذات و الانانية • |
| خیمەگای زمانەئەدەبیەکەمان | :ــ مەڵبەندەکەی ، نەك ( سوپاگا ) • |
| خەستکراوە | :ــ مكثف • |
| خۆدارنین | :ــ تجرد • |
| خوازەکاری | :ــ مجاز ، استعارة • |
| خوازەواتا | :ــ واتای خوازراو • |
| خاڵبەندی | :ــ علامات الترقيم • |
| خۆزەحمەتدان | :ــ تكلف • |

« د »

| | |
|---|---|
| دواوان | :ــ ملتقى • بەو شوێنە دەڵێن کە چەند ئاوێکی تێدا بەیەك دەگەنەوە • |
| دیـاردە | :ــ ظاهرة • لە دیاردەی راوەکەروێشـــکەوە هاتوە کە لەلانەدا بەدیدەکرێ • |
| دەســتەمۆ | :ــ ألیــف • |
| دڵنیـایی | :ــ إطمئنــان ، دڵئاسوودەبوون • |
| دووبـــاد | :ــ تأکیــد • |
| دووپـــات | :ــ تکرار ، دووبارەبوونەوە • |
| دەنگـە مەندەکـان | :ــ دەنگی وێستاو بەبێ‌بزوێن • |
| دژوار | :ــ نەکلۆك : نەگونجاو ، تضاد • |
| دەنگـدار | :ــ حروف غیر حرکیة • |
| درێژەبـۆر | :ــ الضمة الطویلـة • |
| داهێنـــان | :ــ ابـــداع • |
| دابین کـردن | :ــ ضـبط • |
| دابینکـەر | :ــ الضابط ( القواعد ) • |
| دەنگـی قەبە | :ــ الصـوت الضخـم • |
| دەنگـی گـر | :ــ الصوت الخشـن • |
| دەمەقـالی | :ــ جـدل ، مسـاجلة • |
| دۆش دامـان | :ــ وێستان لە بێ‌دەسەلاتیدا • |
| دەربـڕین | :ــ تعبـیر • |
| دەرفـەت | :ــ منفـذ • |
| داچەسـپاندن | :ــ تثبیــت • |
| دەربازگـە | :ــ منطلـق • |

| | |
|---|---|
| دەستەواژە | :ـ شبه جملة • |
| دەرەکی | :ـ خارجي • |
| خانەبێزاری | :ـ تۆران لە شتی میراتی • |
| دانەیدەنگی | :ـ الوحدة الصوتية • |
| دارێژراو | :ـ مصوغ • |
| دالی نەرم | :ـ لين ، سووك • |
| دەستەشێوە | :ـ فرع اللهجة • |
| دەستووربووژاندنەوە | :ـ زیندوکردنەوەو بەکارهێنانی • |
| دەقەزمانیەکان | :ـ النصوص اللغوية • |
| درێژەبزوێن | :ـ الحركة الطويلة • |
| دەنگی وێستاو | :ـ حرف صوتي غير متحرك • |
| دەنگەژێکان | :ـ الاوتار الصوتية • |
| دووسەرە | :ـ لە دوو لاوە ••• •••• |
| دارشتن | :ـ الانشاء ، الصياغة • |
| دیارناو | :ـ اسم علم • |
| دیفتونگ | :ـ تێكترینجانی دوو بزوێن بۆ راکێشانی تاقە دەنگێك • |



« ر »

| | |
|---|---|
| ڕێنووس | :ـ دەستووری ئیملا ، لەسەر کێشی ( ڕێزمان ) • |
| ڕێنووسەوان | :ـ وەك (زمانەوان) شارەزای دەستووری نووسین • |

رەچاوكردن :ــ پەیڕەوكردن ( اتباع ) •
رەدووكەوتن :ــ بەشوێنداڕۆیشتن ( تعقیب ) •
رەبەق ، سەڵت :ــ مطلق •
رامبوون :ــ تعوّد •
رامیاری :ــ سیاسەت •
رایەكخستن :ــ توحید الاراء •
راناوی لكاو :ــ الضمائر المتصلة •
راناوی ئیشاری :ــ ضمائر الاشاره = اسم اشاره •
راناوی لێكدەر :ــ اسم موصول •
راگرەكان :ــ المقومات •
رەمەكی نووسین :ــ نووسینی بەرەڵاو بێسەرەوبەرە •
راستەوخۆ ، ناراستەوخۆ :ــ یەكسەر ، نایەكسەر = مباشر ، غیر مباشر •
راوێژ ••• :ــ استشارة •
رەنگڕشتن :ــ تخطیط •
رێژگە ••• :ــ صیغە • هەندێ (رێژە) ەی بۆ بەكاردەهێنن، بەڵام ئەمیان لەبیركاری = ریاضیاتدا بۆ : « نسبة » چەسپیوە •
رەوانبێژی :ــ بلاغة •
رابووردووی نزیك :ــ الماضي القریب •
رێڕەو :ــ نهج ، مذهب •
رێگەی بڕگەیی :ــ الطریقة المقطعیة •
رابووردووی بەردەوامی :ــ الماضي الاستمراري •
راڤەكردن :ــ شرحو لێدانەوە •

ریزپـەڕ :ـ مسـتثنی •

روخسـار :ـ ملامـح •

رەسـەن :ـ أصـیل •



## « ز »

زەین ، زەینکـاری :ـ ذهن ، ذهنکاری ، ووردەکاری •

زەبەنـد :ـ زۆرو بێشمار ( هائل ) •

زاراوە :ـ مصطلح ، هەندێ تێکیانداوە ، دەنووسن : زاراو •

زەقکردنـەوە :ـ ابرازو دەرخستن •

زەینترازان :ـ زەینخلیسکان •



## « ژ »

ژیری ، ژیـر :ـ عقل ، عاقـل •

ژیـربیـژی :ـ علم المنطق •

ژیـربێژیـانە :ـ منطقـي •

ژێـر :ـ کسـرة ( ی = ـــــِـــ ) •

درێـژەژێـر :ـ ژێری داکشاو ( کسرة طویلة ) •

ژێـری فرەکورت :ـ کسرة مختلسـة •

« س »

سـەر ••• :ـ فتحـة ( ـــَــ ) =

مەخت گـیر :ـ نائاسانو گیرو بەزەحمەت •

سـواوە ••• :ـ سووككراو بە لێ‌کەم‌کردنو گۆڕین •

سـەڵـت :ـ مجـرّد ، مطلق •

سـەرپیچـی :ـ معارضـة •

سـووڕگە :ـ مـدار •

بێ‌سرەوت :ـ بێ‌قـەرار •

سازگە ( حرف ) :ـ مخـرج •

سەرژمێری ( ئامار ) :ـ إحصـاء •

سـرك •• :ـ نادەستەمۆ ( غير اليف ) •

سەمـەرە :ـ سەیرو عەجایەب •

سەرچاوەکـان :ـ المراجع ( بۆ بابەتەکتێب ) •

سـرووش :ـ وحی ، إلهـام •

سـەربەند :ـ سەرەتای فقـرة •



« ش »

شـێوە ( اللغة ) :ـ لهجـة ، دیالێـکت •

شـێوەگۆڕکـێ :ـ نووسینی وشەو بێژە بە چەند شكلێكـی جیا ، جیا •

شـەقـڵ :ـ طابع / بۆ ئیمزاش دەستدەدا •

شـی‌کردنـەوە :ـ تحليل / لە لێك‌هەڵوەشـاندنی خـوری‌و مەرەز وەرگیراوە •

شـەتەكدان :ـ تێك‌بەسـتن‌و جەڕاندن •



« ف ، ڤ »

| | |
|---|---|
| فۆنـەتیـك | :ـ دەنگسـازی • |
| فــۆرم | :ـ حجم ، قەبارە • |
| ڤێـربتوبـی | :ـ کرداری ناتەواوو یاریدەدەر • |
| فەرهـەنگ | :ـ قامـوس • |
| فەرهەنگسـتان | :ـ دائرة المعارف ، الموسوعة • |
| فەسـال | :ـ |



« ق »

| | |
|---|---|
| قـەوارە | :ـ بۆ ( کیان ) بەکارهێنراوە ؟ |
| قـەراردادە | :ـ بڕیاری تایبەتی • |
| قـەبە ( صوت ) | :ـ هۆڕاق ، ضخم • |
| قرتاندن ( ڕێزمان ) | :ـ ترخیـم • |
| قرتـاو •• | :ـ مرخّـم • |
| قـەڵەمڕادان | :ـ الاسترسال والاستزادة في كتابة اى شيى ، او فيما يكتب عليه • |
| قورسـەدەنگ | :ـ آكسان ، النبرة الصوتية • |



« ك »

| | |
|---|---|
| كوتومـت | :ـ بالضـبط • |
| کەشـیدە | :ـ کورتەهێل ، نیمچە سەر ( ــــَــ ) تەریب / باشترە لە « تەقەڵ » • |
| کورۆکزانیی زمـان | :ـ فقه اللغة ، فیلۆلۆژی • |

کێشــــه :ـ صراع • کۆڵکێشان بۆ ( خەله ) •

کــار ، کــردار :ـ فعل / فرمان ـ یشی پێدەڵێن •

کــارا ( الادارة ) :ـ عامــل •

فاعل • بکــەر •

کـــرده :ـ فعال / بەواتای ( کراو ) یش دێ •

کەلەبــەر :ـ کەلێن • فرجة • فراغ •

کرداری ســاده :ـفعـل بسـیط •

= = لێکدراو :ـ فعل مرکب •

کۆمەڵە دەنگ :ـ المجموعة الصوتية •

کارتێکــردن :ـ تأثير •

کارتێکــران :ـ تفاعــل •

کەوتنەوێــزه :ـ پەلاماردانو ئامبازبوونی شت •

کوتانەوه ( قول ) :ـ جوونەوەو تێهەڵچوونەوه •

کەینوبەین :ـ نهێنی و ( اسرار ) •



« گ »

گــەردان :ـ تصریف / بۆ باری وشەسازی •

گــیراوی :ـ شـــدّة ( ـــــّـــــ ) •

گیراوپیتیگیراو :ـ مشدد / له کوردیدا به دووبارەی پیت •

گیروگرفــت :ـ مشــاکل •

گــۆگــردن :ـ النطق ، التلفظ •

گارۆیــی :ـ رەوتی لەسەرخۆو بەردەوام •

گەمەی زمــان :ـ لعبة لغويــة •

گەردبــین :ـ زەرەبین •

| | |
|---|---|
| گەڕیدەکـان | :ــ المتجولون الغربـاء • |
| گــەروو | :ــ قورِگ ، وەك ( گەرووی بەرداش )• |
| گینگلە •• | :ــ تەپاوتل دان ( تقلّب ) • |
| گیرۆدەبــوون | :ــ گیرپێوەخواردن ، تووش بوون • |



« ل »

| | |
|---|---|
| لێکۆلینەوەی بەراوردانە | :ــ دراســة مقارنة • |
| لارەدەنگـی | :ــ الإمـالة • |
| لەنگەرگرتـن | :ــ التـوازن • |
| لکێــن | :ــ الصــاقي • |
| لاف لێدان | :ــ الادعـاء والتباهي • |
| لەوزەی دابین بووندا | :ــ کە بەدەستوور زەبت بکرێ • |
| لێداتاشـراو | :ــ مشـتق منه • |
| لێك دراوی پارچەتەواو | :ــ مرکبات ذات اجزاء کاملة • |
| لاسـایی | :ــ چاولێکەری و تەقلیدی • |
| لارووێـر | :ــ چەوت و چەوێل • |
| لەقەبرغـەدان | :ــ لەکەلەکەکوتاندن • |
| لایەنگـری | :ــ تەرەفـداری • |



« م »

| | |
|---|---|
| مەند ، پیتی مەنـد | :ــ وێستاو ( حرف صحیح ) • |
| منگــە | :ــ غنــە • |
| مەلبەنـد | :ــ معقل ، مرکز • |

| | |
|---|---|
| مۆرفێــــم | :ــ ئەو دانەدەنگیە یان ئەو کۆمەڵە دەنگەیــە کە تەنها ئەرکی ڕێزمانی دەبینــێ ، لە وشەسازیو ڕستەسازیدا • |
| مۆرفۆلۆژی | :ــ وشەسازی • زانستیی وشەگەردانی • |
| مارکــە •• | :ــ نیشـــانە • |
| میـــانە •• | :ــ بەندیواریو پەیوەندی ( علاقة ) • |
| مامــەڵە | :ــ سەربەسەرێ ( معاملة ) • |
| مەزنایەتــی | :ــ گەورایەتی / پتر بۆ بیجگەی (مادده) • |



« ن »

| | |
|---|---|
| نمایــان | :ــ ئاشــکرا • |
| نمایـــش | :ــ عرضو نواندن • |
| نیمچەبزوێــن | :ــ شبە حرکة ( اشمام ) • |
| نیمچەبڕگــە | :ــ شــبە مقطع • |
| نووســیار | :ــ کاتــب • |
| نووســەر | :ــ ئەدیــب • |
| ناچــڵ ، نیوناچل | :ــ ناتــەواو • |
| نیگـــا ••• | :ــ لحظة ، تیلەچاو • |
| ناودێــری | :ــ اشــتهار ، شهرة • |
| نوقلآنەبەخێــر | :ــ تفـــاؤل • |
| نیـــان | :ــ نەرمو شــل • |
| نــاوازە | :ــ نــادرو بەدەگمەن • |



« و »

| | |
|---|---|
| وزه .. | ـ: هێز ، طـــاقة . |
| وێچـــوون | ـ: مشـــابهة . |
| وێچـــواندن | ـ: تشـــبيه . |
| وروژانـــدن | ـ: الإثـــارة . |
| وانـــاى‌بنجـــى | ـ: المعنى الاصـــلي . |
| وێســـته | ـ: وقفـــه . |
| وێســـتگه | ـ: موقف ( المواصلات ) . |
| وشەى فەرهەنگـــى | ـ: الكلمات القاموسية . |



« هـ »

| | |
|---|---|
| هەڵكشـــاوى | ـ: حـــرف المـــد . |
| هێشوەبزوێن | ـ: لـــه بـــاوەڕى هەندێكـــدا : كۆبوونەوەى چەند ( حركة ) يەك بەيەكەوە !! |
| هەڕەمەكـــارى | ـ: بێ‌سەرەو بەرەو تێكەڵ . |
| هەنـــدەران | ـ: ولآتانى دەرەوە . |
| هۆگربوون | ـ: ئاشنايەتى‌بەستن . |
| هانابـــردن | ـ: التشـــبث . |
| هێڵەسەرەكيەكان | ـ: الخطـــوط الرئيســـة . |
| هەرێمايەتـــى | ـ: |
| هەمەچيـــزە | ـ: هەموجـــۆرە . |
| هـــەودا | ـ: خيـــط . تـــاڵ . داو . |
| هەراســـان | ـ: بێ‌زاربوون . |
| هـــەراش | ـ: هەرزەكار ( يافع ) . |

هاوكێشـــه :ـ معادلـــة .

هونەرەبەیانیەكان :ـ الفنـــون البيـــانية .

هەموار ، ناهەموار :ـ لەبـــار ، نالەبـــار .

هاتنـــەدی :ـ تحقـــق .

هاوبـــەش :ـ مشـــترك .



« ی »

یەكانگیربوون :ـ بەیەكگەیشتن ( تلاقي ) .

یەكبوون :ـ وحـــــدة

یەكخســـتن :ـ توحيـــد .

یەكالاكـــردن :ـ تشـــــريح .



## [ سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە ]

١ ــ قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول / تأليف توفيق وهبي / ١٩٥٦ .
٢ــ فەرهەنگی خاڵ جزمی یەکەم/نووسراوی شێخ محەمەدی خاڵ/چاپی یەکەم .
٣ــ گوڤاری کۆڕی زانیاریی کورد / ژمارە یەکەم چاپی ــ ١٩٧٣ــ .
٤ــ هەمان سەرچاوە ، ژمارە چوارەم / ١٩٧٦ .
٥ــ ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا / حامید فەرەج / ١٩٧٦ .
٦ــ ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی / نووری عەلی ئەمین / ١٩٦٦ .
٧ــ ڕێنووس طاهیر صادیق / ١٩٦٩ .
٨ــ نووسینی کوردی بە لاتینی ــ جەمال نەبەز / ١٩٥٧ .
٩ــ القواعد الاساسية لدراسة الفارسية / الدكتور ابراهيم امين الشواربى / القاهرة الطبعة الرابعة .
١٠ــ فەرهەنگی مەهاباد / گیو موکریانی / چاپی یەکەم ــ ٢٥٧٢ ــ ی کوردی .
١١ــ فرهنگ مردوخ / جلد اول / شێخ محمد مردوخ .
١٢ــ دەستوور وە فەرهەنگی زمانی کوردی ، عەرەبی ، فارسی / علاء الدين السجادی ، چاپی یەکەم ــ ١٩٦١ ــ .
١٣ــ دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی / أ ــ ب هەوری / ١٩٦٨ .
١٤ــ ڕابەری مامۆستا / عمر عبدالرحيم / ١٩٦١ .
١٥ــ فصول في فقه العربية / تأليف الدكتور رمضان عبدالتواب / ١٩٧٧ .
١٦ــ بڕێ لە کتێبەکانی قوناغی سەرەتایی .
١٧ــ وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی / ئەندامی کارا ــ مەسعود محەمەد چاپی ــ ١٩٧٤ ــ .
١٨ــ گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی / نووری عەلی ئەمین ــ ١٩٥٨ .
١٩ــ سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی / محەمەد ئەمین هەورامانی ١٥/١٠/١٩٧٤ .
٢٠ــ دەست نووسی کتێبی : ــ قریوەیەك لە چواروەزەی زمانیکوردیدا ــ رەئووفی ئەحمەد ئالانی / ١٩٧٧ .
٢١ــ دەست نووسی نامیلکەی ــ بڕێ لە تایبەتەکانی زمانی کوردی ــ نووسینی رەئووفی ئەحمەد ئالانی .

# پێـــڕەس



---


رقم الايداع في دار الكتب والوثائق ببغداد ٣٢١ لسنة ٢٠٠١

من منشورات الهيئة الكردية في المجمع العلمي




# خطوة اخـــرى
# على طريق تثبيت الاملاء الكردي
# على نهج صحيح سهل

مجموعة بحوث كتبت بهدف ازالة العثرات الباقية على طريق تثبيت الاملاء الكردي بطريقة صحيحة سهلة ، وألقيت الثلاثة الاولى منهـا في النـدوة التي اقامتهـا الهيئة الكـردية في المجمع العلمـي بتاريخ ٢٤/١٠/١٩٩٩ .

( باللغـة الكـردية )

مطبعة المجمع العلمي ـ بغداد

١٤٢٢هـ * ٢٠٠١م